# سروه

٥٢
خەزەڵوەری
١٣٦٩

ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ وئەدەبی کوردی
«ئینتیشاراتی سەلاحەدینی ئەییووبی»



گۆڤاری ئەدەبی ، فەرهەنگی سروە - ساڵی شەشەم ژمارە ٥٢ خەزەڵوەری ١٣٦٩ - نرخ ٢٠ تمەن



# «گازە»

ئەی بێ کەسی کەس نەدار، تۆ کەسی بێ کەسانی — خاوەنی چی مەوجوودات، زەمین و ئاسمانی

هەر کەس، کە تۆ نەناسێ گێژ و وڕ و نەفامە، — نووری ئاسمان و زەوی، هومێدی ئامیانی

بە پێوەسی قودرەتت، کێشاوتە نەخش و نیگار — زیندووی، هەر بووی و دەبی، هەر تۆی کە بێ مەکانی

هەموو بانگەواز دەکەن، لە وانەی خاوەن دڵن — تۆ بۆ ئەربابی عوقووڵ، بە وێنەی ڕۆژ عەیانی

شاهان، کە دان لە دەرگات، زەلیل و دیل و ملکەچ — «احسن الخالقین»ی، خوای هەردوو جیهانی

تەرازووی عەدڵ و تۆڵە تۆ دادەنێی لە مەحشەر — دەکەیتە شاهیدی لەش، دەست و چاو و زمانی

ئەتۆوە بەرقەرارە، چەرخی ئاسمان و زەوی — موحتاج بە تۆن بوونەوەر، تۆش ڕەحیم و ڕەحمانی

نزیکتر لە ڕەگی مل، بەو کەسەی هاوار دەکات — «سەرخۆش» ئەو ساتەی دەکەی، بە چاوی دڵ بڕوانی

مەلا عەلی سەلیمی

«سەرخۆش»

# نێوەرۆک





رووبەرگ
شوانەکانی کوردستانی تورکیا
دیاری:گەوهەری ـ لە ئالمانی
رۆژاوا



پشت بەرگ
کاری : مێهری پاکزاد
لە مەهاباد

## سەروتار

"فەرهەنگی نەتەوایەتی، زمانی کەلی"

وێڕای سڵاو لەخوێنەران:

رژیمی کۆرکراوی پەهلەوی وەک باقی رژیمە چڵکاوخۆرەکانی سەربە رۆژهەلات ورۆژاوا لەسەر ئەو رێبازە دەرۆیشت کەکۆمەڵگایەکی یەکدەست پێک بێنێ تاباشتربتوانێ کاری چەوساندنەوە وکارلێکێشان راپەڕێنێ ودنیابکاتەبەهەشتی ژمارێکی کەم لەملهوڕان و خوێنمژان. یەکەم هەنگاو بۆ گەیشتن بەم ئامانجە تواندنەوە و داپلۆسینی کەلە جۆراوجۆرەکان بوو. هەربەوەدەلیلە زۆرتێدەکۆشان ریشەوبنەماوبایەخی فەرهەنگەکان بشارنەوە وحاشایان لێ بکەن و لەبەرچاوان سووکیان بکەن تا زەمینەی خۆ دۆڕاندن وفرچک گرتن بەفەرهەنگی رۆژاوایی ورۆژهەلاتی باشترئامادەبکەن. دەورێبازەدا - سەرۆکایەتی دام ودەزگا بەکرێ گیراوەکان هەرجوو لانەوەیەکی فەرهەنگی یان بەدژایەتی دەکەلێ خۆدێنا ئەژماروزۆر بەتوندی بەرەنگاری دەبوونەوە. دەوسەردەمی- داکەس زاتی نەبوو دێرێک بەکوردی بنووسێ یابەئاشکرا شێعرێک بە

زبانی زکماکی خۆی بلێ. لەبیرمان نەچۆتەوە کە پێش شۆڕش ئەگەر دام ودەزکای ئەمنی شانووسراوەیەکی کوردی یان لەکەسێك گرتبا باسی سەربوو. کوشتن و لەسێدارەدان وکۆت وزنجیردەهاتە گۆڕێ و رزکاری دژوار بوو. بەمجۆرە وردە وردە دەماندی کە فەرهەنگی نەتەوەکان کزدەبوون وتێدادەچوون وئەم رەوەندە بەتایبەتی لە کوردستاندا تەوژمی زۆرتر بوو.

شۆڕشی مەزن وخاوەن شکۆی ئیسلامی ئێران لەسەربنەمای مەکتەبی خۆی وافکردەکاتەوە کە هیچ جیاوازی و سەرەتی یەك دەنێوان گەلان وزمانان ونەژادان دانیە وهەموویەکسانن. ئەگەرباشیش بیربکەینەوە دەبینین کە دەولاتی ئێمەدا هیچ نەتەوەیەك نیە کە نەکەوتبێتە ژێرکارتێکردنی فەرهەنگی دەوڵەمەندی ئیسلامی. هەربەودەلیلەش دەئەسڵی پازدەهەمی دەستووری گشتی دا کەلك وەرگرتن لەزبانی نەتەوەیی دەچاپەمەنی ودەنکبەرەکشتی یەکانداوتەنانەت خوێندنی ئەوزبانانەدە مەدرەسەکانیشدا ئازادکراوە. بەوفرێتە پێویستە کە فەرهەنگە نەتەوەیی یەکان دەولاتی ئێمەدا زۆرتر تەتەڵەبکرین وپەرەپێ بدرێن وببووژێنرێنەوە تا تا ئارەزومەندیمان بۆ فەرهەنگی رۆژاوا و رۆژهەلات کەمتربێتەوە. ئێمە دەبی بە دۆزینەوەی کەسایەتی راستین وهەویەی واقیعی خۆمان کە دەزەمانی دەسەلاتداری میری یە کۆڕکراوەکاندا لێمان ئەستاندرا - بۆوە بۆدرێژەدان بە بزووتنەوەی سەربەستی خوازی بەوفەرهەنگە دەوڵەمەندە نەتەوایەتی یانە چەکداربین وبتوانین هێرش و شالاوی بیانی یەکان بەرپەرچ بدەینەوە. لەلایەکی دیکەشەوە پێویستە پێوەندی قووڵی نێوان ئەم فەرهەنگانە و فەرهەنگی ئیسلامی کە وەك کەلاڵەیەکی نوێ دەدنیای هزروبیرکردنەوەدا ئێستا هاتۆتەگۆڕێ ودەنیزامی کۆماری ئیسلامیدا رسکاوە- پتەوتر بکەین. کومان دەوەدانیە کەفەرهەنگە نەتەوەیی یەکان بەدرێژایی زەمان هێرشیان بۆکراوە وبۆ نارەسەن کردنیان زۆر تەقالادراوە. هەرفەرهەنگێك دەبەرچاوگرین هێندێك کەوتۆتە ژێرکارتێکردنی فەرهەنگەکانی دیکەی جیهان. لەئاکامدا ناتوانین بڵێین ئەم یانە و فەرهەنگە بەتەواوی رەسەن وبێ خەوشە وهیچ عەیب ومەرەدێکی نیە بەڵام ئەگەرباش وردبینەوە تێ دەگەین کەئەم نارەسەنی یانە دە فەرهەنگی گەلانی ئێراندا زۆرکەمە وهەموو فەرهەنگەکان رۆحی فەرهەنگی ئیسلامیان تێدا دەدرەوشێتەوە.

بۆنموونە کاتێك دەڕوانینە شێعروفۆلکلۆری کوردی دەبینین کە فکروبۆچوونی ئیسلامی دە هەمواندا بەرچاوە، تائەوجێگایەی کەناتوانین فەرهەنگی ئیسلامی لەفەرهەنگی کوردی وگەلانی دیکەی ئێرانی لێك هەڵاوێرین. فەرهەنگی نەتەوەی ئێمە پێش ئیسلام وپاشا - نیش فەرهەنگی تەوحیدە کە خوای مەزن دەقابغی ئایین دا بۆئێمەی ناردووە ورێکەی بەختەوەری نیشان داوین. فەرهەنگی ئێمە تێکەلاوێکە لەئایین و رێبازی تەوحیدی وجوانی وتایبەتمەندی یەکانی جوکرافیایی وسروشتی وئینسانی. ئادەمیزاد وا خولقاوە کە جوان پەرست بێ ولە ناحەزی بێزاربێ. جا هەر فەرهەنگێك جوان پەرست بێ و دە هێلی ورێبازی تەوحید داهەنگاو بنێ ئیجابی یە وئەگەردژی راوەستێ سەلبی یە کەوابوو ئەرکی چاپەمەنی ودەنکبەرەکشتی یەکان ئەوەیە کە "بایەخە"کان بچەسپێنن و "دژبایەخ"ەکان بقرتێنن.

ئاشکرایە دەنێوخەلکی ولاتی ئێمەدا چینێکی گەورە هەن کە زمان وزاراوە فارسی یەکان نازانن ولەبەهرەی سەوادوخوێندن بێ بەشن وناتوانن رۆژنامە و کۆواروکتێب وەخوێنن. جا پێویستە کەهەنگاوی کاریگەر بۆخەبات دەگەل بێسەوادی وفێر کردنی زمانە نەتەوەیی کان شان بە شانی زمانی فارسی هەڵبگیرێ تابایەخە رەسەنەکانی شۆڕشگێڕانە وئیسلامی - کە هەمووئادەمیزادێك بۆژیانی بەختەوەرانە وپاکژ پێداویستی پێ هەیە- دەقابغێکی شیاودا بدرێ بەجەماوەری خەڵك کەبتوانن ئەوبایەخانە بەقووڵی تێ بگەن ئێمە ئەگەر باسێکی زۆر رەسەن بەزمانی ئینگلیزی بۆ عەرەبەکان بلاوکەینەوە رەنگە لێی تێ نەگەن وسەرنجیان رانەکێشی. خودای گەورەش کاتێك بیەوێ ئایینێك بۆگەلێك بنێرێ بەزمانی

ئەوکەلەی دەنێرێ بۆئەوە دەپەیامی ئیلاهی بکەن وبەپاراوی کەلکی لێ وەرکرن· زۆربەهرەی خودادادد دەکۆمەڵکادا هەن کە بەزمانێکی تایبەتی کەشە ناکەن وناپشکوون · یانی ئێمە خەلکانێکی زۆرمان هەیە کەشارەزای فەرهەنگی فارسی نین بەلام بەسەرزبان و فەرهەنگی خۆیاندا زالن· کەوابوو دەبێ بکەڕێینەوە سەرفەرهەنگ وزبانی نەتەوەیی خۆیان وویڕای پالاوتن وگەشە پێدانی فەرهەنگەکەیان هەرلەوفەرهەنگە بۆکەشەپێدان وخستنە رووی بایەخە ئیسلامییەکان کەلك وەربگرین · هەبوونی کیروگرفتی زۆروکەمایەسی هەڵساو لەبۆ چوونی رەگەزپەرستانەی رژیمی رابردووی ئێران بۆتە هۆی دواکەوتوویی گەلی کوردوباقی گەلانی ئێران و زۆرزەبری پاشکەوتوویی لێداون·

کەلی کورد هەرچەند خاوەنی فەرهەنگی هەراوی دەوڵەمەندن لە روانگەی زانست وتێکنیکەوە پاشکەوتوون وتووشی زۆرتەنگ و چەڵەمە هاتوون· پێویستە بۆلە ناوبردنی ئەم کەندو کۆسپانە هەنگاوی پێویست هەڵبگیرێ · بەختەوەرانە بەهۆی بەرەی خودادادوعەلاقەیەکی کە دە نەتەوەکەمان داهەیە هیواداریـن ئەم کەم وکووڕییانە لە ناو هەڵگیرێن ·

## سرمقاله

### " فرهنگ ملی ، زبان قومی "

با سلام به خوانندگان عزیز ، رژیم سابق ( پهلوی ) همچون سایر رژیمهای دست نشانده‌ء شرق و غرب بنا را بر حذف انسانها و استثمار آنان گذاشته و هدفش این بود که مردم را برای بهره‌کیری تعداد قلیلی از افراد ثروتمند و مستکبر آماده کند · لذا اولین کامی که در این جهت برداشت کرفتن شخصیت اقوام مختلف از آنان بود · به همین دلیل تمام سعیش بر این بود که ارزشهای اصیل موجود در فرهنگهای مختلف را نادیده گرفته و انکار نماید و به مردم بفهماند که فاقد هر کونه اصالت فرهنگی اند تا زمینه‌ء اثر پذیری از فرهنگ غربی در آنان پدید آید · در همین راستاکسانی که در راه رشدوتعالی وشکوفایی ناشناخته‌های فرهنگی وقومی قدم برداشته و در این جهت حرکت میکردند را در تضاد با امنیت دستگاه حکومتی خود میدید و با آن به شدت برخورد میکرد · در آن زمان هیچ کس جرات نمیکرد حتی یك خط کردی بنویسد و یا یک شعر کردی بکوید · به خاطر داریم که اکر مامورین امنیتی شاه به کسی مشکوك میشدند و در بازجویی و بازرسی ،نوشته‌ای به زبان کردی بدست میآوردند فقط زندان و تبعید پایان ماجرا نبود · از اینرو به تدریج شاهد از بین رفتن فرهنگهای قومی مردم ایران زمین خصوصا "کردستان بودیم · از آنجاکه انقلاب اسلامی بر اساس مبانی مکتبی اش معتقد است که تفاوتی بین اقوام و زبانها و نژادهای مختلف وجودندارد وهمه یکسان هستند و اصولا" ما درکشور خود هیچ قومی را نداریم که تحت تاثیر فرهنگ غنی اسلامی قرار نکرفته باشد · لذا با صراحت در اصل پانزدهم قانون اساسی به بهره کرفتن از زبانهای محلی و قومی در مطبوعات و رسانه‌های کروهی و حتی تدریس آنها در مدارس در کنار زبان فارسی اشاره شده است · از اینرو یکی از ضرورتها این است که هر یك از فرهنکهای قومی کشور ما که خود یك فرهنگ غنی است بیشتربا ز و شناسانده شود تا چنانچه نیازی به فرهنکهای شرقی و غربی احساس میشود . از بین برود ·ما باید با یافتن شخصیت حقیقی و هویت واقعی که در طول حاکمیتهای کذشته از ما کرفته شده بود برای تداوم حرکت استقلال طلبانه خود به این فرهنکهای غنی ملی مسلح باشیم و بتوانیم در مقابل تهاجمات بیکانه مقاومت کنیم · از طرف دیکر لازم است پیوند عمیقی که بین این فرهنکها و فرهنگ اسلامی -به‌عنوان طرحی نو در جهان اندیشه‌و در برهه ء حاضر مطرح شده و در نظام جمهوری اسلامی تبلور یافته وشرق

و غرب روی آن حساب میکنند ، تقویت شود . شك نیست که فرهنگهای قومی و ملی در طول زمان مورد تهاجم قرار گرفته‌اند.

هر فرهنگی را که در نظر بگیریم خواه نا خواه از فرهنگهای دیگر تاثیر گرفته است . در نتیجه ما هیچ فرهنگی را نمیتوانیم کاملا" اصیل و تمام قسمتهای آنرا صحیح بدانیم . اما روح اصلی و بخش عمدهء هر فرهنگ قومی ایران را که بررسی کنیم میبینیم نه تنها هیچ تضادی با فرهنگ اسلامی ندارد بلکه در بیشتر موارد با بهره‌گیری از احساسات ویژه و روحیاتی که مردم به لحاظ نژاد و زبان و ادبیاتشان در طول تاریخ به آن خو کرده‌اند ، فرهنگ اسلامی درمیان آن قوم شکوفاتر شده است . مثلا" وقتی اشعار و داستانهای فولکلوریك کرد را بررسی میکنیم میبینیم در تمامی آنها افکار غنی اسلامی وجود دارد یعنی ما فرهنگ ملی کرد و اقوام دیگر ایرانی را نمیتوانیم از فرهنگ اسلام جدا کنیم . فرهنگی که مردم ما دارند چه قبل از اسلام و چه بعد از اسلام متاثر از آن فرهنگ توحیدی است که خداوند در قالب دین بر مردم عرضه‌کرده و به آنان گفته است که اگر میخواهید سعادتمند باشید این طور زندگی کنید . مردم در ادوار - مختلف هم متاثر از فرهنگ دینی بوده‌اند و هم موقعیت جغرافیایی و قالب زندگیشان فرهنگی را به آنان تحمیل کرده است . درفرهنگ ما ، هم روح دینی و متاثر از وحی وجود دارد و هم ویژگیهای دیگر طبیعی ، مثلا" خداوند انسانرا طوری خلق کرده است که زیبا

پسند است و از زشت متنفر است . این زیبایی در قالب کلمات فصیح و شیوا عرضه میشود . یعنی ما به طور متقابل از اینها بهره برداری میکنیم ضمن آنکه باید به این اصل کلی توجه داشته باشیم که فرهنگهای قومی تا آنجا که در خط فرهنگ توحیدی قرار داشته باشند مثبت و آنجا که با آن تضاد پیدا میکنند منفی هستند و رسالت مطبوعات و رسانه‌های گروهی هم همین است که ارزش ها را مطرح و ضدارزشها را حذف کنند . یقینا" در میان مردم ما قشر عظیمی هستند که با زبان و گویش فارسی آشنایی ندارند و از سواد خواندن و نوشتن نیز بی بهره‌اند تا مجلات و کتب فارسی را مطالعه نمایند . لذا ضروری است که اقدامات جدی در جهت مبارزه با بی سوای و آموزش زبانهای قومی در کنار زبان فارسی به عمل آید تا ارزشهای اصیل انقلابی و اسلامی انسانی - که اصولا" کل بشریت در جهان برای داشتن یك حیات سعادتمند و طیب به آن نیاز دارد - در قالبهایی به مردم ارائه شود که بتوانند آنهارا عمیقا" درك نمایند . ما اگر یك بحث بسیار منطقی را به زبان انگلیسی برای مردم عرب زبان بگوئیم آنرا درك نمیکنند و برایشان جاذبه ای ندارد . خدا هم وقتی میخواهد دینی را بفرستد آنرا به زبان مردمش میفرستد . برای اینکه در آنان اثر کند

و آن حرف محتوای لازم را در قالب کلام به مردم برساند . استعدادهای زیادی در جوامع مختلف وجود دارد که با یك زبان مشخص قابل شکوفا شدن نیستند . یعنی ما مردم زیادی را در کشورمان داریم که آشنایی به فرهنگ فارسی ندارند و در عین حال بر فرهنگ خودشان مسلط هستند . در نتیجه باید به فرهنگهای قومی و ملی خود مراجعه کنیم و با طرح ارزشهای اصیل و درست آنها ضمن آنکه خود فرهنگ را از آلودگی ها پیراسته میکنیم و آن را رشد میدهیم در عین حال از آن فرهنگ برای طرح و گسترش ارزشهای اسلامی استفاده نمائیم . وجود مشکلات عدیده و کمبودهای ناشی از تفکر نژاد - پرستانه‌ای که در رژیم گذشته موجود بود ، باعث شده که مردم کرد نیز مثل سایر اقوام دیگر ایران عقب نگهداشته‌شده و متحمل صدمات زیادی شوند . مردم کرد علیرغم اینکه از فرهنگ اصیلی برخوردار است به لحاظ دانش روز دچار مشکلات زیادی است و باید در جهت رفع این نقیصه گامهای موثری برداشته شود . خوشبختانه به دلیل هوش و استعداد و علاقه‌ای که در مردم ما وجوانانش وجود دارد امید است که بتوان این نقیصه را جبران کرد .

"خدا نگهدارتان"

# هەواڵێکی فەرهەنگی

ڕۆژی پێنج شەممە ڕێکەوتی ١٩٩٠/٩/٢٠ بەرامبەری ٦٩/٦/٢٩ کۆنگرەیەکی گرینگ و مێژوویی لە ئەندامانی "یەکیەتی نووسەرانی کوردستان"ی" عێراق و "کۆمەڵەی نووسەرانی کوردستان "ی عێراق پێکهات کە لە لایەن ناوەندی بڵاو کردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کورد (ئینتشاراتی سەلاحەدینی ئەییووبی ) یەشەوە چەند نوێنەرێك بانگهێشتن کرا بوون و بەشداری یان تێدا کرد . کۆنگرە دە حاڵ و هەوایەکی ئازادانە دا پێکهات و لە ئاوێتە بوون و یەکگرتنی ئەم دوو ڕێکخراوە فەرهەنگی یانە " یەکیەتی نووسەرانی کوردستان "پێکهات کە قەرارە لە مەودوا ئۆرگانێکی تەنیا بە ناوی نووسەری کوردستان " و هەواڵنامەیەك بە ناوی بانگ بڵاو بکاتەوە . کۆنگرە لە سەر چەند خاڵێکی گرینگ هاو-دەنگ بوو ن کە لێرە ئاماژە بە چەند خاڵێکیان دەکەین :

١ ـ سەقامگیر کردن و پەرە پێدانی ئەدەبی بەرەنگاری

٢ ـ هەوڵ و تەقا لای زۆرتر بۆ پێکهێنان وپەرە پێدانی زمانی ئەدەبی یەکگرتوو ، هەروەها چەسپاندنی ڕێنووسێکی یەکسان و سەرانسەری .

٣ ـ زیاتر دەرفەتو بوار خۆشکردن لە بەردەم وەر - گێڕان و بڵاو کردنەوەی بەرهەمی نووسەرانی کوردو ناساندنیان بە خوێنەرانی جیهانی .

٤ ـ زیاتر گرینگی دان بە ئەدەبی منداڵان و لاوان و تەرخان کردنی بەشێك لە" نووسەری کورد "بۆ ئەم مەبەستە .

٥ ـ گرینگی یەکی تایبەتی بە کۆکردنەوەی فۆلکلۆر بدرێ بە مەرجێ لە کاتی تۆمار کردنی دا دەسکاری دیالێکتەکان نەکرێ .

٦ ـ بڵاو کردنەوە و کۆ کردنەوەی بەرهەمی نووسەرە کۆچ کردووەکان .

٧ ـ مێهرە جان ( جێژنەوار ) ێکی سا ڵانە بۆ شێعر و چیرۆك و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی لە شوێنێکی گونجاودا ساز بکرێ و پێشانگایەکی تایبەتی بۆ بڵاو کراوەکانی یەکیەتی ڕێك بخرێ .

# نامەیەک لە جوانڕۆوە"

برایان من لە عێراق لە پۆلی پێنجەمی ئامادەیی ( زانیاری ) وانەم خوێندووە و ئێستا لە جوانڕۆ چوومەتە قوتابخانە ( دبیرستان طالقانی جوانرود ) وە هەر وەها فارسی باش نازانم وەکوو خۆتان ئەزانن وانەکانی ئێران هەمووی فارسی یە . جا ئێستا ئیمتیحانم داوە . ئەڵێن ئەگەر دەر نەچیت ئیتر ناتوانی لە ئێراندا بخوێنیت. برایان تەنیا من نیم کە لە جوانڕۆ دەرس ئەخوێنم وە لە ئۆردووگاکان وەکوو کەنگاوەر و سونقور منداڵان وەریان گرتوون و دەرس ئەخوێنن وە من داوای هاوکاریتان لێ ئەکەم .

" عومەر هەڵەبجەای "

ئیدارەی پەروەردە و بار هێنانی شارستانی جوانڕۆ

وێڕای سڵاو

ئاواتی شادی و سەرفەرازی بۆ هەموو بەرپرسان و ئەندامانی ئەو ناوەندە دەخوازین و دەگەڵ ئەم نامەیە وەرگێڕدراوی نامەی یەکێك لە ئاوارەکانی کوردی ئێراقیتان پێشکەش دەکەین کە لە بابەت گیر و گرفتی زمانی فێربوونەوە بۆ ئێمەی ناردووە . گیر و گرفتی زمان زۆرتر ، بەرلە ناردنی قوتابی بۆ قوتابخانە دەبێ بە دەورەی تایبەتی چارەسەر بکرێ . بە بڕوای ئێمە بە سەرنج دان بە نزیکایەتی و خزمایەتی زمانەکانی کوردی و فارسی دەکرێ ئەو قوتابی یە کوردە ئێراقی یانەی کە بڕیارە بچنە قوتابخانە ، لە ماوەیەکی کورتدا فێری فارسی بکرێن و گیرو گرفتی زمانی بۆ ئەو تاقمە چارەسەر بکرێ . بۆ ئاگاداری ئێوە ، نامەی نووسەرەکەشتان پێشکەش دەکەین هەتا بۆ چارەسەر کردنی ئەو گرفتە گرینگەی موسوڵمانە ئاوارەکان کە بەراستی شایانی هەر چەشنە یارمەتیدە و هاودەردییەکن هەنگاوی پێویست هەڵبگیرێ .

ناوەندی بڵاو کردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی



# گرنگی راگەیاندن وپەیام لەروانگەی ئیسلامەوە

نووسەر: کاروان «تەنیا رەشید»

نووسین وراگەیاندنی بەخەڵکی بەواتای هەڵگرتنی مەشخەڵ وکڵپە پێدانی شۆڕشی دەروونی وخرۆشاند- نیەتی، تامرۆڤ بەرەو ئامانجی "خۆ" بە واتای فەلسەفی - بەرێ و ئەو مرۆڤە بتوانێ لە گێژاوی پڕ "مەترسی" ژیان ومەترسی یەکانی "بەکۆ"ی دەروونی رزگاری بێ و ژیانێکی ئاسوودە وکامەرانی بگرێتەبەر.

بەلام جۆرێك نووسین و راگەیاندنی ژەهراوی ترمان هەیەکە دەیەوێ شۆڕشی دەروونی مرۆڤلە نێو بەرێ ویا خود ئارامی بکاتەوە وهەروەك هێرۆیین ومۆرفین مرۆڤ بخاتە جیهانی کەروێشکی یەوەولە کۆتاییدا بەرەو نابوودی ونەمان بیبا..

ئەم دووشیوە نووسین و راگەیاندنەمان هەیە، یەکەم نووسینیان هەمیشە مرۆڤ بەرە و "خۆناسین" ونزیك بوونەوە لە ئامانجی دەبا و وای لێدەکا کە هەست بطبوون "ی خۆی بکا و بەرەو "دروست بوون"ی بەرێ (بودن تاشدن)، هەروەها هەو ڵ دەدا تەوەرەی خۆی وەك مرۆڤێکی هەستیار- فەلسەفی نەك ئەدەبی - لەچوارچێوەی بوونیدا -فیزیکی و خۆیەتی - بەدەوری چەق(مەرکەز)ێکی دیاری کراودا بسووڕێنێتەوەو هەرچی رەفتار وکردار وفەرمانی هەیە سەرچاوەکەی ئەو چەقەیە و هەر ئەوچەقەش بەلێپرساوی خۆی دادەنێ.

شێوەی دووهەمیان کەژەهراوی بە هەمیشە مرۆڤ والێدەکا کە بە هەستێکی ئاژەڵی هەبێ وتەنیا وەك مێروولەیەك کە ئامانجی بە لای ئەوەوە ئامانجی مرۆڤە - گولەگەنمێك بێ وسکی پێ تێربکا و ئیتر نەزانی بۆچی وکەی وچیە وهەیە ونیە و...وئەگەرهات و لێی بپرسی جیهان چیە تەنیا کونێك وئەو رێگایەی بۆگەنمەکەی دەبا ولامیەتی !! ولە بارەی بوونی بوونەکانی ترەوە هیچ نازانێ و بگرە ئەگەر قسەشی لە تەکدا بکەی بلێی بوونی تریش هەیە بڕواناکا و هەر وەك ئەومرۆڤە وایە کە بۆ ئەوەی بسەلمێنێ کە ئاسن نقوم دەبێ پارچە ئاسنێك دێنێ وفڕێی دەداتە ناوئاوەکە ونقوم دەبێ تۆش بۆ ئەوەی بۆی بسەلمێنی کە نوقم نابێ پاپۆڕێکی بۆدەهێنی بەلام ئەوهەر باوەڕناکا !!

بەلێ دەزگاراگەیاندن و بلاوکەرەوەکانی رۆژهەلات ورۆژئاوا لە جۆری دووهەمن کە دەیانەوێ بە هەمووشێوەیەك مرۆڤ بەرە و کەساسی ونەفامی وبێهۆشی بەرن، جائەگەر بە رێگای رۆمانەکانی (ئالبێرکامۆ وسارتەروکافکا و ئاکاتاکریستی و....) بێ یان بە رێگای شانۆگەری یەکانی (یوجین یونسکۆ ود. هـ. لۆرانس و تینیسی ویلیامزسارتەرو...)بێ یا لە رێگای بیردۆزەداتاشراوەکا - نی جیهانی نەخۆشی شارستانیەتی رۆژئاوا ورۆژهەلات( بەقسەی ئارنولدتوێینبی و شبلنجەرو - رەجا "رۆژە گارودی و...) بێ یا وەك (مارکس وئەندریەپیر و داروین وسیگمۆند فرۆید وسارتەرو. .....) بە رێگای ترساندن و تۆقاندنی میللەتانی بێ هێز و بێ دەسەلات بێ.

لێرەدا شتێکی سەیردێتەپێش چاو ئەویش، ئەگەر بێتوو بۆ بنەڕەت و نژادی ئەوانە بگەڕێین دەبینین هەموویان سەربە نەژادی خۆپەرست وبەرژەوەند پەرستی

جوولەکەن وبگرە زۆریان هەولّیان داوە پارە وپوولّ بۆ قەوارەی زایۆنیزمی و یەهوودی لە فەلەستینی داگیرکراوماندا کۆ بکەنەوە. هەرسارتەر بوولە خۆ پێشاندانەکانی مانگی حەوتی سالّی ١٩٦٧ ی زایینی داد ژی مسولّمانان بەشداری کرد وپارە وپوولّی بۆ جوولەکە وقەوارەکەیان کۆکردەوە . لەوەش زیاتر "سارتەر" و "سیمۆن دوبۆڤار " و "کلۆد لاترمان"ی هاورێیان سێ بەسێ هاوبەشیان دەکرد تاخەلّکی مسولّمانی میسر پێش شەڕی شەش ڕۆژەی عەرەب وجوولەکە، خەلّکی میسر سەرگەرم بکەن بە ناوی کۆنفرانسی ئەدەبی یەوە!!

ئەوەی لێرەدا مەبەستمە ئەوەیە کە نابێ ئێمە بە چاوێکی تەنیا ئەدەبی یەوە سەیری ئەدەب و وێژە بکەین بەلّکوو بە چاوێکەوە کە تەواوکەری لایەنەکانی تری مرۆڤ بێ نەك پچڕانەنی لایەنەکانی تری مرۆڤ لە وێژە و ئەدەب .

سەیری ڕۆلّی رامیاری ئەمڕۆ بکەین لە کاتی وەرگرتنی پاداشی ئەدەبی ووێژەیی "نۆبێل" لەلایەن لێژنە ونووسەرانەوە، سەیردەکەین ئەوەی خزمەتی بە جوولەکە نەکردبێ ئەو بلفۆرە ئەدەبیەی " بەقسەی شەهید کە نەفانی " نادەنێ ، لەوانە بۆنموونە- نەك ژماردن - "ئەلبێرکامی "کەخاوەنی بیروڕای بێهوودەگی و خۆکوشتن و... هتد) نۆبێلی وەرگرت . "ئەگنۆن"ی جوولەکە کە کەس لە جیهاندا نایناسێ وخۆشی هیچ لە ئەدەبی جیهان نازانێ "نۆبێلی" وەرگرت و لەوانەشە ئیمسالّ بە جەنابی "سەلمان روشدی" نۆبێل بدرێ!

کەوابێ ئەوەی دەستی لە مراندنی لایەنێکی ژیاندا نەبێ ئیمڕۆ وشارستانیەکەی چەپلّەی پۆلێ نادەن ونیشانی نادەنێ.

ئیمڕۆ لە کۆمەلّی "بە ناو " رۆشنبیرانی کوردەواریشدا هەر هەمان پێوەر کێشی پێدەکرێ. ئەگەر یەکێك بیەوێ لە بارەی کوردەواری ونەخۆشی یەکانییەوە بدوێ ، بێ نرخە!! بۆچی ؟چونکە بەزمانی لالّی ئیمڕۆی ئەورووپایی وئەمریکایی وورووسی و کۆنسیۆشی وئاویستایی قسەناکا!! نووسینی ئیسلامی کە تەنیا پاشماوەی مرۆڤایەتی کۆن و تازەیە ،گوناهێکە مرۆڤی ژیری شمشالّی و فیکەیی پێی نارازییە چونکە دووبارەیی ودووپاتی و چەند باری یە!!

لەکاتێکدا نووسینی ئیسلامی بۆپارە وپوولّ و هەزار دۆلاری و دیناری نیە ، بەسەیرکردنی پەیام وراگەیاندنی لە روانگەی ئیسلامەوە راستی ئەم" بۆچوونە " دەردەخا ودەیسەلمێنێت کەنووسین ونووسەری ئیسلامی لە بەشی یەکەمی چەشن وشێوەی نووسینەکە مرۆڤ بەرەو خۆناسین وخواناسین دەبا . ئەمەش سەرەتای گۆڕین و چاك بوون ورۆیشتنی مرۆڤ بەرە و تەکامول وبەرەو پێشەوە چوونی رەورەوەی شارستانیەتی مرۆڤایەتی بەوهەروەها هەرهەمان خۆناسینە کەوا لەمرۆڤ دەکا هەرچی کاری هەیە لەقسەونووسین و..... هتد بۆرەزای خوابێکا ، نەك بۆخۆ هەلّکێشان وریایی و تۆمارکردنی ناولەمێژوودا! یا دەرخستنی رۆلّی رەگەزێك وشانازی کردن بەسەر رەگەزکانی ترەوە!!

لە ئیسلامدا پەیام وراگەیاندن کە نووسین بەشێکە لێیان نرخ و گرینگی یەکی زۆری پێدراوە و بگرە خوای گەورە سوێندی بەقەلّەم خواردووە( ن،والقلم ومایسطرون) - وەبگرە گرنگی یەکەی بەشێوەیەکە لەوباوەڕە دام - ئەگەرنووسەرانی ئێستا مەرجەکانی نووسین بزانن زۆربەیان دەست لەقەلّەم هەلّدەگرن! وەبگرە گرنگی یەکەی- بەرای من وەك"قازیەتی" وایە کە لەچیرۆك وبەسەرهاتەکانی "قازی"یەکاندالە کاتی فەرمانڕەوای ئیسلامدا ئەو کارەیان قەبوولّ نەدەکرد، یان بە بێزاری یەوە ئەوکارەیان دەکرد ، ئەویش لەبەر ئەوەبوو کە نەوەکوو ستەم وزوولّم لە یەکێك بکەن و نەزانن ستەمە، ئەمە بوو یەك یا چەند کەسێك ئەم کارەیان قەبوولّ نەدەکرد، جاچی بەوە بلّێین کە هەزارەها خەلّك بە گومرایی دەبا بەنووسینێکی گومرا!

جاباسەیرێکی مەرجەکانی پەیام راگەیاندن لە روانگەی ئیسلامەوە - کە نووسەرانی کورد بەشێکن لێی - بکەین ،تابزانین چەندە ئەرکێکی گران وسەخت و پڕ لێپرسراوی یە.

١- دەبێ هەرچی پەیام رادەگە -

یەنیێ سەرچاوەکەی لەقورئانەوە بێ ولە خواوە هاتبێتە خوارەوە ، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کەزانیاریەیە مرۆڤیەکان رەت بکاتەوە ،بەڵکو دەبێ ئەو زانیاریانە بگونجێ لە گەڵ فیترەت وسروشتی مرۆڤایەتی وهەروەها دژی ئایین ومەزهەبە خواییە یەکان نەبێ. خوای گەورە لەسوورەتی "اسمائدە" ئایەتی "٦٧" دەفەرموێ: **بلغ ما انزل الیك من ربك.**

گرنگی ئەوەی کە پێویستە ئەو مەرجانەی لە خاڵی یەکەمدا باسمان کرد لەو "نووسینە دا " هەبێ، لەبەر ئەوەیە کە نووسەری ئیسلامی باوەڕی بەوەیە کەخوا ئێمەی ئافەریدە کردووە و هیچ بەڵگە ویاساو ریرەوێك لەبەڵگە ویاساو رێرەو ی یەکانی خوا چاکتر نیە، چونکە خۆی خوا "بە تەنیایی" دەزانێ چی بۆ باشە و چی بۆخراپە و مرۆڤایەتی هیچ کاتێك ناتوانێ شتێك لەوەباشتر بدۆزێتەوە یان بیگۆڕێتەوە بە شتێکی تر هەروەك لەسوورەتی الفاطر ئایەتی "٤٣" دا دەفەرموێ: **فهل ینظرون الاسنت الاولین،فلن تجدلسنت الله تبدیلا، ولن تجد لسنت الله تحویلا.**

٢- دەبێ شارەزایی یەکی تەواوی هەبێ لە ئیسلامدا .

٣- نووسینەکانی لە لایەن خواوە پاداشی هەیە ولێپرسراوە بەرامبەری ، وەئەگەر هات ومرۆڤێك رێنوێنی بکا ، بەشدارە لە چاکەکانی ئەومرۆڤەدا بەبێ ئەوەی لە پاداشی ئەم مرۆڤە کەم بێ وە ئەگەر مرۆڤێك سەرلێ شێواو و گومرا بکا ، ئەوابەشدارە لە خراپەکانی ئەو مرۆڤەدا .

٤- درۆنەکردن بەزمانی ئیسلامەوە " پەیامی خواو" ولە سوورەتی "النحل"ئایەتی ١١٦ ئەم مەسەلەیە بەجوانی روون کراوەتەوە

**ولاتقولوا لماتعصف السنتکم الکذب هذا حلال وهذا حرام(** بۆ چی؟**)لیفتروا علی الله الکذبه** (سەرئەنجامەکەی) **ان الذین یفترون علی الله الکذب لایفلحون.**

٥- نابێ ناو وناتۆرە و "گاڵتە پێکردن" و... هتد بەیەکتری بکەن جائەگەر بە نووسین بێ یا قسە هەروەك لە ئایەتی "١١ "ی سوورەی (الحجرات ) دا دەردەکەوێ **یاایها الذین امنو** ( ئەوانەی بڕوایان بە خوا هەیە) **لاسیخرقوم من قوم عسی ان یکونواخیا " منهم ولانساء من نساء عسی ان یکن اخیرا " فیهن** (نازانم خوای مەزن بۆچی ئافرەتی دەستنیشان کردووە) **ولاتلمزوا انفسکم ، ولاتنابزوابا لالقاب.**

٦- ئەگەر هات وبیەوێ رەخنەیەك وەیا خود باسێك یا لێکۆڵینەوەیەك بکا و بینووسێ دەبێ بە بە ڵگەوە هەروەك لە ئایەتی "١٢٥"ی سوورەتی "النحل " دا دەفەرموێ:

**ادع الی سبیل ربك بالحکمة...**

وەهەروەها داوای بەڵگەش لە بەرامبەر ێکە هەروەك لەئایەتی "..."ی سوورەتی "البقرە"دا دەفەرموێ:

**قل** (فەرمانە) **توا برهانکم ان کنتم صادقین .**

بەڵێ لە ئیسلامدا هەروا هەرمەکی نیە .

٧- لە بۆروون کردنەوەی راستی رەخنەیەك یان "ئاژاوەیەك"ئەگەر ئەدەبی بێ ویا لە بوارێکی تری کۆمەڵگادا ،دەبێ "نووسەر" یا "قازی" ئەو رەخنەیە وراستی و دروستی بە پێی یاساکانی قورئانی یەوە یاخودکار و رەفتار و تارەکانی پەیامبەری مەزن هەڵیسەنگێنن ، وەك خوای مەزن لە سوورەتی "النساء" ئایەتی "٥٩" دا دەفەرمووی:

**فان تنازعتم** (لێرەداپڕترین وشە بە کارهێنراوە) **فی شی فردە** (فەرمانە)**الی الله والرسول** (ئەگەر ) **ان کنتم تومنون** (بەکی ) **بالله و الیوم الافر**(باشە بۆچی ) **ذلك خیرو احسن تاویلا.**

٨- دەبێ نووسە ریاپەیام راگەیەنەر بەشێوەیەکی جوان و باشترین رێباز بکرێتەبەر بۆ وت وبێژ یا رەخنە یانووسین یا.... هتد) . هەروەك خوای مەزن لە سوورەتی "النحل" ئایەتی "١٢٥" دا دەفەرموێ:

**وجادلهم** (چۆن) **بالتی هی احسن** ... نەك بە تۆمەت و فریودان وگوم کردنی مرۆڤ لەتۆ ولووی قسە ونووسیندا ، هەر وەك خوا دەفەرموێ لە ئایەتی "١١٢"ی سوورەتی "النساء" دا ، **ومن یکسب خطئة اواشما "** (چون) **ثم یرم بە بریئا " ، فقد احتمل بهتانا " و اثما " مبینا "** بڕوانە لاپەڕەی ٦٢

# زمانی هونەر لە زمانی یەڵماز گۆنەوە





● دیاری: محەمەد کاکەسووری

**ک . ش - جەنابتان هەڵوێستی دواکەوتووانەی پیاوتان زۆر بە جوانی لە فیلمی یۆڵ پێکاوە . بگرە خەڵکە شۆڕشگێڕەکانی نێو فیلمەکەشتان بە هەمان شێوە نیشان داوە . لێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوە ، کاراکتەری ئیجابی یا خود قارەمان بە چ شێوەیەك دەتوانرێ بەکەر بخرێ؟**

**بەواتایەکی تر یەکێك لەو رەخنانەی کە لەبارەی فیلمی "یۆڵ"ەو بیستوومە ئەوەیە دەڵێن فیلمی "یۆڵ" راستەواقیعی باروزرووف وچەوسانەوەو گیرو گرفتەکانی جەماوەر دەخاتە روو بەلام کەم وکورتی لەوەدایە کە قارەمانێکی دەو ر سەرەکی دەو فیلمە دانیە؟**

یەڵماز گۆنەی : نەخێر هیچ دەورێکی قارەمانانەی ئاشکرای تێدا نیە .

**ک . ش - دەکرێ زیاتر بیروڕای خۆتان لەم بارەوە دەر ببڕن ؟**

یەلماز گۆنەی : من بۆ ئەم رەخنەیە تەنها وەلامێکم هەیە.تێگەیشتنی خەڵك بۆ قارەمانی ئیجابی لە گەڵ تێگەیشتنی من زۆر جیاوازە . دەتوانم بڵێم وەك ئاسمان و ریسمان وایە . دەنا فلیمەکەی من لایەنی ئیجابی زۆر تێدایە ئەوەی راستی بێ من دەمەوێ پەی بە لایەنە ئیجابی یەکانی قارەمانێکی سەلبی یا بارو دۆخێکی سەلبی ببەم و نیشانی بدەم . چونکە ئەم دوو لایەنە دژ بە یەك هەمیشە بە یەکەوەن و بێ یەکتری دەرنابەن هەر ئەوەشە کە پێی دەگوترێ یەکێتی دژەلایەنی.جا با چەند نموونەیەك لە فلیمەکە خۆی وەربگرین :

سەید هیج بە تەنگ ژنەکەیەوە ناچێ ، کاتێ کە لە نێو بەفرەکەدا خەریکە دەمرێ و گیانی دەر دەچێ . بەلام لە دوا سات و هەر لە سەرەتاشەوە لە ناخەوە لە گەڵ خۆیدا دژ و ناکۆکە . لە خودی خۆی دڵنیا و ئارخەیان نیە ، دەغەزارە و خۆی دەخواتەوە ، ئەوەتا لە دوا ساتدا هەوڵ دەدا فریای بکەوێ . کاتێ کە دەشمرێ زۆری خەفەت بۆ دەخوا . زۆری سوێ لێ دەبێتەوە . سەر - ئەنجامیش هەر لە سەرینی خەم و خەفەتەوە شکست دێنێ و دەڕووخێ و پەژیوان دەبێتەوە . ئەمە شتێکی زۆر ئیجابی یە . بەلای منەوە یا خود با بێین محەممەد بە نموونە بێنینەوە . محەممەد ئەوە کەسەیە کەمالی خەزووری دەیکووژن . ئەو زەلامە هەموو ژیانی لە سەر بناغەی درۆ رۆناوە تا

بلێی درۆزنە کە چی دەگۆڕێ ٠ جا وەنەبێ لە پرێکیشدا بگۆڕێ ٠ بەرە بەرە دەگۆڕێ ٠ محەممەد ئەگەر چی درۆزنە بەلام تا بلێی پیاوێکی ئازا و جەسوورە ٠ ئەو جەسارەتەی هەیە دان بە راستی دا بنێ و بلێ : بەلێ من تاوانبارم لە سەرینی منەوە بوو ٠ لە سۆنگەی هەلاتن و ترسنۆکی منەوە بوو ، ژن براکەم بە کوشت چوو ٠ ئەو جەسارەتەی هەیە ئەم قسانە بە مالی خەزووری بلێ کە چی پێشتر زۆر درۆزن بوو ئەمە شتێکە تا بلێی ئیجابی و دلخۆشکەرە ٠



یا خود با بێین ئەو گەنجە کوردە وەربگرین کە کەس و کاری لە گوندێکی قاچاخچیان دەژین ئەو کورە گەلێ چاو نەترس و بە جەرگە ٠ ئەوە تا دەلێ : من تازە گەر لە سەریشم بدەن ناگەرێمەوە بۆ زیندان وەکوو برا شەهیدەکەم بەو کەژ و کێوانە دەکەوم ٠ بەم شێوە یەتێگەیشتنی من بۆچەمی ئیجابی یەت و ئەوەی دەمەوێ وەك شتێکی ئیجابی لە ژیانا پێشانی بدەم بریتی یە لە گۆران لە هەنگاو نان لە بارێکەوە بو بارێکی تر ٠ من وەکوو هێندێ خەلك لە روانگەیەکی چەسپاوەوە بۆ شتی ئیجابی و سەلبی ناچم ٠ من دەمەوێ هەموو توخمەکان پێشان بدەم ٠ پێزەی ئیجابییەت لە منا لانی سەلبییەت دەر بێنم ٠ بۆیە من ئەوە بە رەخنە نازانم چونکە لە هەموو شتێکی سەلبیدا تروسکەیەکی هیوا هەیە،دوا رۆژ هەیە ، پێزەیەکی ئیجابی بۆ ئایندە لە بارایە ٠

**ك٠ش ـ بە رای تۆ فیلمەکانت یا خود بە شێوەیەکی گشتی ، هونەری شۆڕشگێرانە چ رۆلێك لە بەرە و پێشەوە بردنی جوولانەوەی شۆڕشگێری لە تورکیا و ولاتەکانی تردا دەبینێ ؟**

یەلماز گۆنەی : یەکەو دوا قسەی من خەباتی چینایەتی یە ٠ خەباتی چینی کرێکارە بۆ دەست بە سەراگرتنی دەسەلاتی سیاسی ، بێگومان ئەم خەباتەش قۆناخی جیا جیای هەیە ٠ ئێمە خەباتی سیاسیمان هەیە ٠ خەباتی ئابووریمان هەیە ، هەر وا خەباتی روشنبیری و ئایدیۆلۆژیشمان هەیە ٠ جا کاری هونەری بە شێوەیەکی تایبەتیش هونەری، بە شێوەیەکی تایبەتیش هونەری سینەمایی،بەشێکە لە جۆری خەباتی سێهەم،بەشێکە لە شێوە خەباتی رۆشنبیری و ئایدیۆلۆژی ٠ بەلام لە هەمان کاتدا خەباتێکی سیاسیشە ٠ چونکە دەکرێ بە هۆی هونەری سینەماوە جەماوەری خەلك جۆش و خرۆش بدرێ ، کار لە هەست و نەست و سۆزیان بکرێ پەرە بە رادەی تێگەیشتن و هۆشیاری یان بدرێ و هەر وەها سۆز و عاتفەشیان بەرە و لای شۆڕش وەر بچەرخێندرێ ٠ بەلام بزووتنەوەی هونەری ، کاری هونەری بە تەنها ناتوانێ بە تەواوی ئەرك و فرمانەکانی خەباتی سیاسی هەلبستێ ٠ دەبێ بە چەند کارێکی سیاسی تەواو بکرێ ٠ دەبێ ـ چەند کارێکی سیاسی لێ بکرێ ٠ بۆ ئەوەی بتوانێ ئامانج و مەبەستەکانی خۆی بپێکێ رەوانیە ئێمە بێین هەموو ئەرك و فرمانەکانی خەباتی سیاسی لە ئەستۆی هونەر شە تەك بدەین.چا لاکی هونەر هەر تەنها دەتوانێ رێ بۆ بزووتنەوەی سیاسی خۆش بکا ٠ ئەستەمە سەرجەمی رۆلی سیاسی بە ئەستۆی کاری هونەری یەوە گرێ بدرێ خەباتی سیاسی دەبێ بە چەند چا لاکی یەکی سیاسی یانە بە نموونە نووسین ، راقە کردن ، لێکدانەوە و تەفسیر کردنی بار و دۆخەوە دەستە بەر بکرێ٠ئەمە لە لایەکەوە،لە لایەکی ترەوە پێویستە ئەو هەل و مەرج و بارودۆخەی تێیدا دەژین لە بەر چاو بگرین ، بە مەش دەتوانین بە شێوەیەکی راست و دروست دەس نیشانی جۆری ئەو جەماوەرە بکەین کە دەبێ هەولی بۆ بدەین و پەیامی خۆمانیان پێ بگەیەنین ٠ پێویستە هەولیش بدەین زۆربەی زۆری

> بەم پێودانە دەتوانین بڵێین : هونەر چەکە ، هونەر بازووە ، بەڵام هونەر زمانێکی تایبەتی خۆی هەیە ، زمانێك کە تەنها تایبەتی هونەرە .

جەماوەر بەرە و لای خۆمان راکێشین • هونەر کار دەتوانی هونەرێك بگۆرێنێ تەنها لە خزمەتی جەماوەرێکی کەمدا بێ بەڵام ئەو جەماوەرە کەمە زۆر تا کەم لەو خەڵکە پێکهاتوون کە هوشیاریەکی دیاریکراویان هەیە ، کەمێ زانیاری یان لە بارەی ئەو هونەرەوە هەر هەیە • هەر بۆیە من هەمیشە رووی دەمم ئاراستەی جەماوەرێکی بەر فراوان دەکەم.بەڵێ ئەمە ئامانج و مەبەستی منە • ئەم مەسەلەیەشم هەر لە سەرەتاوە لە گەڵ خۆمدا براندوتەوە.لەم رووەوە دەبینم هەندێ خەڵك و برادەر هەن لە روانگەیەکی زۆر تەسك بینی یەوە رەخنە لە کارەکانی من دەگرن• ئەوان لەوە ناگەن کە من دەمەوێ خۆم بە جەماوەرێکی بەرفراوان بناسێنم .دەرك بە وەش ناکەن کە هونەر بوارێکی تایبەتی یە و نابێ ئەوەی لێ چاوەنۆڕ بکرێ هەموو ئەرك و فرمانەکانی بزووتنەوەی سیاسی وەئەستۆ بگرێ • بەڵام ئەم جۆرە رەخنانە بەلای منەوە ئەوەندە گرنگ نین • هەر لە بەر ئەمەش بوو یۆڵ سەرکەوتنێکی باشی بە دەست هێنا و تا ئێستاش هەر بە سەرکەوتوویی ماوەتەوە • فیلمی یۆڵ تا ئێستاش جەماوەرێکی زۆر سەیری دەکەن • ئەمەش شتێکی رێکەوت نەبووە • مەبەستی خۆم هەبووە• بۆیە بەو شێوەیەم دەرهێناوە •

هونەر خۆی لە خۆیدا ناتوانێ شۆڕشێك هەڵایسێنێ • بەڵام ئەو هونەرمەندەی کە رێبازێکی سیاسی راست و دروستی گرتبێ و خاوەنی جیهان بینی یەکی پوخت بێ زۆربە ئاسانی دەتوانێ بە هۆی ئیشەکانیەوە جەماوەرێکی باش لە دەوری خۆی کۆ وەکا و پێوەندی یەکی توند و تۆڵێش لە گەڵ خەڵك ، لە گەڵ جەماوەری خەڵکدا ببەستێ ، ئەو پێوەندی یانەش دەشێ لە دواییدا ببن بە پێوەندی سیاسی یانە •

بەو شێوەیە دەبینن هونەر بۆ راپەرینی سیاسی و پرۆپاگەندە بۆ کردنی زۆر سوود بەخش و بە کەڵکە • بەڵام من جۆشدان و پرۆپاگەندەی وشك و برینگ بەو مانا وشکەی وشەکە دەیبەخشێ رەت دەکەمەوە • چونکە ئەو کاتە هونەر لە مانا هونەری یەکەی دەشۆرێتەوە • بەم جۆرە ئەگەر خاوەنی هونەرێکی راستەقینە و شۆڕشگێڕانە بی ئەوا دەتوانێ نە ك هەر تەنها تەئسیر لە جەماوەر بکەی بەڵکوو دەتوانی هونەرمەندەکانی تریش بخەیتە ژێر رکێفی خۆتەوە و مەیدانێکیش بۆ هۆشیاری سیاسی بسازێنێ •

بەم پێودانە دەتوانین بڵێین : هونەر چەکە • هونەر بازووە • بەڵام هونەر زمانێکی تایبەتی خۆی هەیە • زمانێك کە تەنها تایبەتی هونەرە • ئەو زمانەش شایستەی رێزووەجێکی یەکجار زۆرە • گەر رێزیش لە زمانی هونەری نەگری یا خود نەزانی چۆنی بە کار بێنی • ئەوە هەر بەو چەکە لە ناو دەچێ• وەك چۆن تفی بەرەو ژوور نێو چاوی خۆت دەگ رێتەوە•

---

تێ بینی :

ك • ش - کورت کراوەی کرێکاری شۆڕشگێڕە • " رۆژنامەیەکی هەفتانەیەکە حیزبێکی کرێکاری لە ئەمریکا ، بڵاوی دەکاتەوە •



# وەلی دێوانە

ئامادەکردنی : فەتاح فەتاح زادە

شاعیرانی کورد

وەیلان مەریوانی

**" لەم وتارە دا ،لە نووسراوەکانی کاک فەتاح فەتاح زادە وکاک وەیلان مەریوانی کەلکمان وەرگرتووە "**

پەپوولەی باڵ سووتاوی ئەوین،هەردەگێڵێ پێناوی ژین، وەلی دێوانە، ناوی وەلیدە وکوری کوێخا محەمەد مەشوور بە کوێخا حەمەسوورە کوێخای هۆزی کەماڵی لە عەشیرتی جافە• بە پێی هێندێ بەڵگەوە• وەلید لە دەوروبەری ساڵی ١١٨٠ کۆچی ،پێی ناوەتە دنیای پڕ لە کوێرەوەری ورەنجەرۆیی وپەژارەوە،هەر لە تەمەنی منداڵیەوە• باوکی دڵسۆزانەوەلیدی لەلای مەلایۆسۆ ناوەتە بەرخوێندن وهەرلە قوتابخانەکەی مەلایۆسۆدا، دڵە ساکارە کوێستانیەکەی گرفتاری ئەوینی شەم بووە•

شەم، کچی کوێخاقادرە، کوێخاقادریش یەکێك لە سەرۆك هۆزکانی عەشیرەتی جاف بوو• شەم تاقانە کچی کوێخا قادربوو• وبە هۆی تاقانەبوون وخۆشەو-یستی یەوە، پێ یان دەگوت **"شەم"** وناوی **"شەمسە"** بوو• وەلید وشەم، هەرلە منداڵیەوە ،پێکەوە لە حوجرەکەی مەلا یۆسۆدا ، دەیان خوێند ودڵیان لەدڵی یەکتر گرێی دابوو• کڵپەی ئەوینێکی پاك ئاوری ختە دڵیانەوە وسنگی یەکیان کرد بە هەوارگەی دڵداری •••و داستانەکەی قەیس ولەیلایان لە هەورامانی کوردستاندا خولقاندەوە•

داستانی دڵداری وەلید وشەم، تێکەڵاوی ئەفسانە و رازنیە، راستی یەکی بێ رازو رەمز وئاشکرایە•وەرە رای ئەوەیش لە پاکترین وخاوێن ترین دڵدارانی جیهان بوون که دڵداریەکەیان تێکەڵاوی هەوا وهەوس •• نەبووە••• ساکار، ساکار•••وەك کانیاوەروونەکانی چیای شاهۆ، وەك ساکاری هەورامان••• عیشقی شەم وەلیدی بەرەو دنیای رەنگارەنگی شێعر وخەیاڵ هاندا ، وبێ ئەوەی خۆی بزانێ وئەوەی بەبیرا هاتبێ خزمەتێکی گەورەی بەوێژە وئەدەبی کورد کردوە وهۆنراوەجوانەکانی که لە بەرێکی وێژەی کوردی پڕکردۆ تەوە•

دەستی چارە نووس، وەلید وشەمی لە قوتابخانەکەی مەلا یۆسۆ بەیەك گەیاند، باو کی شەم که دەیەویست کیژە تاقانەکەی وەبەر خوێندن بخات، شەمی ناردە قوتابخانەکەی مەلایۆسۆ ماوەیەکی زۆر بەیەکەوەبوون تاکوو، ئەوین ریشەی دڵیانی لەیەك ئاڵاند وپەیمانی خۆشەویستیان مۆرکرد مەلایۆسۆ هەرکە بەم ماجرایە زانی• باوکی شەمی ئاگادار کرد•

لەوسەرەمەدا ، نێوانی دووهۆزباش بوو، باوکی شەم پێشوازی لەم کارە کرد وئاواتە لە مێژینەکەی سەبارەت بە پەیوەندی لە گەڵ هۆزی کوێخا محەمەد دا دەربڕی•

لەولایشەوە کوێخا محەمەد که ئاگاداری داستانەکە بوو• دەست بەجێ چووە داوخوازی شەم و دەست ماچ کرا وئەودوودڵدارە بوون بە دەزگیران، بەڵام باوکی شەمسە دەڵێ :

- باساڵێك بە دەزگیرانی بیان هێڵینەوە تالە کوێستان دەگەڕینەوە•

هەردوو لا ئەمەیان بە چاك زانی، بەڵام قەدەر و چارەنووس ·· ئاخۆقەدەر ····؟!

ئەوساڵە لە هۆبە تووی ناوچەی دیواندەرەمانەوە · لە کەڕانەوەدا بۆگەرمیان ، هەردوولا لە چەند جێگای نزیك چیغ و دەواریان هەڵدا · تارۆژێ قەدەر رەنگی ناکۆکی وئاژاوەی لە نێو دوو هۆزدا هەڵڕشت ··· بەڵگەمان بە دەستەوە نیە کە شەڕوکێشە بە کێهە بەهانە وهۆی گرینگ لە نێوان دووهۆز دا دەستی پێ کرد······ رەنگە هۆ کەی شکاندنی پاوانی یەك· یان لە وەڕگا و ·· بووبێ ··· چەند کەس لە پیاوانی هۆزی کوێخا قادر هێرشیان بردە سەرهۆزی کوێخاحەمەسوور وکوڕێکی کوێخایان کە لە وەلید بچووکتر بوو کوشت وئەمەبوو بە هۆی شەڕوتێك هەڵچوونی دووهۆزوخەم وپەژارەولێك پچڕانی وەلید وشەم··· پیاوانی هۆزی کوێخاحەمەسووریش بۆتۆڵە کردنەوە چەند کەسیان لە هۆزی کوێخا قادر کوشت وئیدی نێوانی دووهۆز بووبە تەپ وتۆز و غاردان وتەقە وقرمە ونفرەت وخوێن وکینە····

هۆزی کوێخاقادر ،باروبنە دەپێچنەوە وو لات بەجێ دێڵن، شەم دڵە سووتاوەکەی وەلی لەگەڵ خۆی دەبات وپەژارە وئەسرین وتاسەی بۆبەجێ دێڵێ · وەلیددەکەوێتە قوڕ پێوان و دەوری مەجنوون دەگێڕێ· رۆژێ دەچێتە هەواری خاڵی ،ئەو جێگایە کە دەوارورەشماڵی هۆزی شەم ماوەیەك لەوێدا هەڵدرابوون·· لەسەرکوانووی بەردەواری ماڵە بابی شەم دادەنیشێ ولەگەڵ بەر دە رەشەکانی کوانووەکەدا دەدوێ:

**کوچکی هەواران، کوچکی هەواران**
**سەختەی بەخت رەش سوختەی هەواران**

**تۆخوا کوچکی کوێ لە کام هەواری**
**وابە دوودئاه، سیاو خەباری**

**وتی سیابەخت ،ستەم کێش خەم**
**پەروانەی پەشێو دوورکەفتەی رووی شەم**

**شوێن ماڵە گەورەی عێلی جافانە**
**هەوارگەی پەری زولف کلافانە**

ئیدی وەلی ، زنجیری ژیایی ئاسایی پچڕاند· وەك شێتی هەردەکێڵ ،وێڵی سارا ونزار بوو· پێڵاوی دڕاوسەرو ردێنی شێواو··جامەی شڕبوو···

**ئوف برینداره، ئوف بریندار ە**
**تۆوی جەرگی منە ،وابریندار ە**

**هەر ئاهی منە سەمای گرتوو ە**
**سەقفی گەردوونی کون کون کردوو ە**

**شیوەنی منە بە کەژو کو دە**
**دەم بە هاواری لەیل و ورۆ رۆدە ·**

چەرخی زەمانە دەسووڕایەوە و وەرزلە دوای وەرز دەهاتن ودەچوون·

خەڵك کەوایان بینی وزانیان ئەگەر چارەسەری دەردی گرانی وەلیدنەکەن لەوە دایە لەنێو ئاوری دەرد و خەما بسووتێ، لەگەڵ مەلای ئاوایی دابە کۆمەڵ چوونە لای کەیخەسرەوخان سەرۆکی عێلی جاف و تکایان لێ کرد ئەودوودڵدارە بەیەك بگەینێ وبەزۆریا بەگەنجی ماڵ باوکی شەم رازی بکات· بەڵام نێوانی دوهۆز خرابتر لەوە بوو کە باوکی شەم، رەزایەت بە ئەم کارە بدات· بەر لەوەی وەلی دێوانە لە نامەیەکدا بۆکەیخەسرەوخان ئەم شێعرانەیش دەنووسێ:

**خەسرەو خەیاڵێ ،خەسرەوخەیاڵێ**
**ئای پەی خان خاس خەسرەو خەیاڵێ**

**بڕوانە جەستەی خەم پێوارم دا**
**وەی کۆمەی دیوان وەحشی سارم دا**

**وەمەیلی ئەسرین دیدەی تارمەد ا**
**وەی دەردی دەروون ئەندۆە بارمەد ا**

**وەی ئاه ونالەی شەوان تارم دا**
**وەی زایەڵەی شین دەرد بێ شمارمدا**

**بەزەییش باماوە جەستە وحاڵم**
**بزانە کوشتەی کام نەونەماڵم**

**بکردا هیمەت چون خانی ماتەم**
**شەم واسڵ وەمن، من واسڵ وەشەم ·**

نامەکەی وەلی یان دا بە کەیخەسرەو خان و تکایان لێ کرد بەڵکوو شەم لە باوکی بستێنێ، کەیخەسرەو خان زۆرهەوڵی دا · بەڵام رۆژێك ریبوارێ ،رێکەوتە لای وەلی دێوانە وبە نیشتەری ،رازی نەبوونی باوکی شەم دڵە زامدارەکەی وەلی ی بە یەکجاری خستە بەرچەقۆی

پەژارە ودەردەوە· ئیدی وەلی دێوانە چیلکەی ئەژنۆی بە کوانووی سنگەوە نووسان بە سیاچەمانەیەکی پڕ سۆزەوە دەستی بە دوعا ونزای باوانی شەم کرد:

**بە کۆی زوخاڵ بێ ، بە کۆی زوخاڵ بێ**
**ماڵی باوانت بە کۆی زوخاڵ بێ**

**دایکت نابینا وزوبانی لاڵ بێ**
**باوکت مردووبێ ژیانی تاڵ بێ**

**بێ کەس دامێنی ،کەست نەمێنێ**
**بایە قوش لە شوێن ماڵتان بخوێنێ**

لە ئاکامدا ، وەلی دێوانە، بە دڵ شکاوی وبە ئاهی دووری شەمەوە· لە ساڵی **١٢١٣** کۆچی بە جوانەمەرگی کۆچی دوایی کرد وسەری خەمەکانی بردە ژێرخاك وئە و عشقە پاك و پڕسۆزوگودازەیە لە ژێرکڵکۆی پڕلە ئاوات وحەزەکانی شاردەوە ولە گۆڕستانی سەید سادقناشتیان وبە پێ وەسیەتی خۆی کێلی قەبرەکەیان بە قەد بالای شەم داتاشی·

پێویستە لێرە دابڵێین ،دەقی شێعرەکانی وەلی دێوانە لە ئەسڵ دا بەزاراوی **"گۆران"**ە ومامۆستای پایەبەرز پیرەمێردی نەمر ئەوشێعرانەی بەئەوپەڕی توانایییەوە· بە زاراوی سۆرانی گۆڕاوە وناوی وەلی دێوانەی بۆهەتاهەتایە زیندووکردۆتەوە، هێندێ پێیان وایەکە ئەم شێعرانە هی پیرمێرد خۆیە· بەلام ئەم بڕوایە هەڵەیە وئێستا شێعرەکانی وەلی ،بە زاراوی گۆران، هەرماون ولە هەورامان ، لە لای مەلایان و کەورە پیاوان دەست دەکەوێ· هێندێ دەڵێن وەلی دێوانە لە بنەماڵەیەکی بن دەست و چەوساوەی هەورامان بووە · نەخوێندەواروشوان بووە وشەم کچی سەرۆکی هۆزی جافە وناکۆکی چینایەتی نەی هێشتوە ئەودوودڵدارە بەیەك بەگەین· بەلام ئەوبۆچوونە هەڵەیە· لەوسەردەمەدا قەت کورە هەژارێکی شوان نەیتوانیوە بچێتە قوتابخا- نەلە کەڵ مندالانی سەرۆك هۆزەکاندا ببێ بەهاوشان و هاوقوتابی··· ڕاستی یەکەی هەرئەوەیە کە وەلیدێوانە کوڕی کوێخا حەمەسووری سەرۆك هۆزی جاف بووە ولە شێعرەکانیشائەم ڕاستی یە دەردەکەوێ کە سەوادیبەرزی بووە· نامە نووسینی بۆکەی خەسرەوخان بەڵکەیەکی تر لەم ڕاستی یە دەردەخات·

داستانی ئەوین داری **"دێوانە وشەم"** وەك مەم وزین ولەیلی و مەجنوون وفەرهادوشرین، بۆتە شەوچەرەی مالان ودەواران ورەشمالانی کورد ستان· بەلام ئەم داستانە دڵ تەزێنە· بە پێچەوانەی ئەوانی تر و داستانی ،ئەمیران وشاهان ومرۆڤانی جیالە خەڵك نیە ترازێدییەکی خەماوی ناکۆکی و شڵەژاوی دووهۆزی کوردە· دووهۆزی لێك براوی یەك عەشیرەتە· کە بە هۆی بە هانەیەکی وەك لەوەڕگا و شکاندنی شەقڵیپاوانی یەك دەست دەبەنەقرمەوشیرو تفەنگ وهێرش دەبەنە سەریەك و ··· دووهۆز دەبن بە دوژمنی خوێنی یەکترین· دوو دڵ···دوودڵدار···دووباڵندەی ئەویندار·قفڵی زنجیرێکی پساون کە هەوڵ دەدەن ئەم زنجیرە لێك پچڕاوە دیسان پێکەوە بنووسێنن ویەکیەتیە تێك چووەکەیان ڕێك بخە- نەوە···دواهۆنراوەی وەلی دێوانە،وەسیەتە مەشوورەکەی ··· کە دەڵێ :

**یاران لە جەرگم ،یاران لە جەرگم**
**شەم شێوە تیری داوەلە جەرگم**
**کەوتمە گیان ئەڵڵا ،دواکاتی مەرگم**
**مەمشۆن وکفن مەکەن وە بەرگم**
**تکایە مەیشۆن جێ برینی لەش**
**بالە زام بنکێ تکەی خوێنی گەش**
**شەهید بێ کفن وبێ شتن چاکە**
**هەرکەس شەهیدبێ بێ گەردو پاکە**
**یاران وصیەتم ئەمە بێ لاتان**
**هەرچەندکەوتوومە دوورە ولاتان**
**تۆخوا باگۆڕم لەرێ خێلان بێ**
**نزیك هەوارگەی کورد وگۆران بێ**

**کێلێکیش بەرزین بەقەدبالای شەم**
**لەسەر گڵکۆم بێ، بێ زیادوکەم**
**تاقی بەوێنەی تاقی بڕۆی ئەو**
**باسوجدە گام بێ بەرۆژو بە شەو**
**بنووسن بە خوێن جەرگی سرکردووم**
**کە من بەتیری دەستی شەم مردووم**
**تاهەرکەس دێ گێلۆمەزارم**
**بزانێ کوشتەی دەستی دڵدارم**
**چونکە شەم گۆنەی تاتاری چینە**
**لە دەشت بیزاروچیانشینە**
**ڕۆژێ هەڵکەوێ لەمراکوزارێ**
**ڕێگەی کەوێتە سەر گۆڕم جارێ**





# گۆتوبێژ لەگەل :

# جەوهەرکورمانج

**ئامادەکردنی : عەزیزکەیخۆسرەوی**

ـ جەوهەر کرمانج ـ یەکێکە لەو نووسەر و شاعیرانەی بیست ساڵە بەردەوام لە گەڵ رەوتی ئەدەبیدا دەڕوات و درێژە بە هاوکاری خۆی دەدا بۆ برەوپێدانی شێعری نوێی کوردی . **بە تایبەتیش** شێعری بەرەنگاری تا ئێستا چوار بەرهەمی چاپکراوی هەیە : " رەز و زریان و مومێکی تر " ، کۆمەڵە شێعر ساڵی ١٩٧٨ ـ جەمیلە ـ چیرۆکێکی درێژی نووسەری قەوخیزی جەنگیز ئایتماتۆف ساڵی ١٩٨٠ وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و بە چاپی گەیاندووە ـ رووباری خوێن ـ ئۆپەرێتێکی شێعریە ساڵی١٩٨٦ لە ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستانی عێراق چاپ کراوە ـ تفەنگ ـ کۆمەڵە شێعرێکە ساڵی ١٩٨٨ هەر لە ناوچە ئازادکراوەکان چاپ کراوە • ئێستاش رۆمانێکی ئامادەی چاپ کردنە بە ناوی " مەرگەسات " جا بۆیە بە پێویستم زانی وت و وێژێك لە گەڵ ئەو مامۆستا خۆشەویستە پێك بێنم •

**پ : <u>وێڕای سوپاسێکی زۆر لە پێشدا حەز دەکەم خۆت بە خوێنەوارانی گۆڤاری سروە بناسێنی •</u>**

و : من لە ساڵی ١٩٥٠ واتە چل ساڵ لە مەوبەر لە گوندی ( خەزنە ) ی نزیك شاری دێرینی هەولێر لە دایك بووم ، لە تەمەنی بیست ساڵیدا هاتمە ناو جیهانی شێعر و نووسینی کوردی و هەر لەم ساڵەش دایەکەم شێعرم بڵاو کرایەوە ، دوای ئەوە لە گەڵ چەند نووسەرێکی شاری هەولێر گۆڤارێکمان دەرکرد کە دوو ژمارەی لێ دەرچوو • بە ناوی ( خەرمانەی وشە ) بەڵام لە بەر بارودۆخی سیاسی ئەو کاتە نەمانتوانی درێژەی پێ بدەین و ناچار بووین شار بەجێ بێڵین و پەیوەندی بە شۆڕشی ئەیلوولەوە بکەین• لە ساڵی ١٩٧٢ وە ئەندامی یەکیەتی نووسەرانی کوردم و دوو ساڵیش سکرتێری رۆشنبیری لقی نووسەران بووم لە هەولێر ، تا دووبارە رژێمی بەعس ناچاریان کردم وەك پێشمەرگەیەك پەنا بێنمەوە بۆ باوەشی شۆرشی نوێ و ئەوە نۆیەمین ساڵە لە دەرەوەم ، دەبێ ئەوەش بڵێم کە دوای ئەوەی رژیم ( یەکیەتی نووسەرانی کورد ) ی بە رەسمی هەڵوەشاندەوە ، بە کۆمەکی چەند نووسەر و ئەدیبێکی پێشمەرگە ( یەکیەتی

نووسەرانی کوردستان ) لە ساڵی ١٩٨٠ لە سێبەری چیا کەردن کەشەکانی کوردستان دامەزرا ، لەو ساوەش وەك نووسەرێك بەردەوام لە ریزی ئەم یەکیەتی یەدا خەباتی ئەدەبیم درێژە پێ دەدەم .

**پ : شێعری ئێستای کوردی چۆن دەبینی ؟ ئایا هەنگاوێکی هەڵگرتووە سیمایەکی جیهانی بە خۆیەوە بگرێ ؟**

و : پێشەکی بە پێویستی دەزانم تەماشایەکی ئەو بارودۆخو زەمینەیە بکەم کەشێعری کوردی تێیدا ژیاوە ، ئێمە لە کوردستانی عێراق ئەگەر چی مێژوویەکی درێژمان هەیە لە خوێندن بە زمانی کوردی و ئاشنا بوون بە شێعری شاعیرانی پێش خۆمان ، ئەڵبەتە دیارە ساز کردنی ئەم زەمینەیەش وا نەبێ بە ویست و ئارەزووی رژیمێك لە دوای یەکەکانی عێراق بووبێ ، بەڵکووبە پێچەوانەوە بەرهەمی چەندین ساڵ خەبات و قوربانی بووە بەڵام دیسان لە گەڵ لەبار بوونی زەمینە زمانی یەکەش ، هەمیشە دەست خراوەتە گەردنی نووسینی کوردی و رژیمەکان نەیانهێشتووە بە ئازادی گەشە بکات بۆیە لە گەڵ ئەم هەموو هەڵکشان و داکشانەی باری سیاسی کورد ، بارە ئەدەبی یەکەش بواری لە بەر دەم تەنگ کراوەتەوە ، کە چی لە گەڵ ئەوەشدا شێعری کوردی توانیویەتی لە سەر دەستی چەند کەڵە شاعیرێکەوە لە رەوتی پێشکەوتنی شێعری دەورو بەر دا نەبڕێ . زۆر بە راشکاویش دەڵێم ، شێعری کوردی ئەگەر دەرگا و پەنجەرەکانیان لە سەر ئاوەڵا بکرێ و بە ئاسانی بگەنە هەموو سووچ و قوژبنێکی جیهان شتێکی ئەوتۆیان لە شێعری جیهانی کەمتر نیە ، بۆ نموونەش دەڵێم ، وەرگرتنی خەڵاتی ـ تۆخۆلسکی لە لایەن شێرکۆ بێکەس شاعیری کورد لە ناو زیاد لە ( ٤٠ ) شاعیری چل نەتەوەی جیا خۆی لە خۆیدا ئەم راستی یە دەسەلمێنێ .

**پ : ئاشکرایە کە ئەوە زیاد لە بیست ساڵە رژیمی عێراقی بە ئاگر و ئاسن بەربۆتە گیانی کورد لە کوردستانی عێراقدا ـ پێتان وایە کە شێعری بەرەنگاری توانیبێتی وەك پێویست رۆڵی خۆی ببینێ ؟**

و : یەك بە باری خۆم زۆربەی شێعرەکانم ، بە تایبەتیش هی ئەم ( ١٠ ) ساڵەی دواییەم شێعری بەرەنگارین ، یا تەقەللایەکن بۆ دەرخستنی سیمای شێعری بەرەنگاری ، شاعیرە شۆڕشگێڕ ونیشتمانپەروەرەکانی دیکەش ئەم لایەنەیان فەرامۆش نەکردووە ، ئەمەش شتێکی دەستکرد و لاسایی نیە ، چونکە کێ هەیە بتوانێ لە ئاستی تاوانی بۆمبارانکردنی شاری هەڵەبجە بێدەنگ بێ

دیارە هەر شێعرێکی کوردیش لە ژێر کار تێکردنی ئەم کارەساتە نووسرابێ کە رژیمی بەغدا بە سەر ئەم شارەی هێنا دەبێ لە ریزی شێعری بەرەنگاری بێ. لە لایەکی دیکە شەوە ئێمە وەك نەتەوەیەکی ژێر دەست پێویستە بە گژ ئەم رژیمە دابچینەوە و پارێزگاری لە بوونی خۆمان بکەین . هەموو نەتەوەکانی دنیاش کە بەم قۆناغەی ئێمە دا تێپەڕیبن شێعر لایان بۆتە چەکێك و روو بە رووی دوژمن کراوەتەوە . ئەوە شۆڕشی فەرانسا ـ ئەراگۆن ـ ی بە دنیا ناساند ، شۆڕشی فەلەستین ، مەحموود دەروێش و مەعین بەسیو ـ و چەندانی دیکەی بە خەڵك ناساند . ئێمەش لەم واقیعانە بە دەرنین ، نووسینی شێعری بەرەنگاریش کەم کردنەوە نیە لە پلە و پایەی شاعیر ، بەڵکووبە پێچەوانەوە پەیژەیەکی لە باریشە بۆ هەڵکەرانی بەرە و لوتکەی نەمری وەکوو هەندێ کەسیش دەڵێن خەفە کردنی لایەنە هونەری یەکەی شێعریش نیە چونکە ئەگەر شاعیر وەستاکارانە هەڵس و کەوت لە گەڵ وشە دا بکات دەتوانێ وێنەی شێعری زۆر جوان بەرجەستە بکات لە پاشان خۆدەبێ شاعیریش لە زەمانی خۆیدا بژی و واقیعەکە بە چاوێکی شێعری تەماشا بکات .

**پ : وێنەی شێعری چۆن تەماشا دەکەی ، پێت وایە شێعری کوردی ئەم لایەنە جوانکاری یەی رەچاو کردبێ ؟**

و : سەر جەمی شێعری کوردی نا ، بەڵام ئەوانەی شوێن پەنجەی دیار و تایبەتیان هەیە لە سەر شێعری کوردیدا زۆر بە چاکی ئەو لایەنەیان رەچاو کردووە ، بۆ نموونە لای خۆمان عەبدوڵلا پەشێو و لەتیف هەڵمەت و شێرکۆ بێکەس و رەفیق سابیر و سەعدوڵلا پەرۆش محەمەدی حەمە باقی و هەقاڵ

کوێستانی و چەند شاعیرێکی تازە پێگەیشتووش وەستایانە وێنەی شێعری لە شێعرەکانیدا بە کار هاتووە ، لە کوردستانی ئێرانیش دا بەخۆشحالییەوە دەڵێم نەوەی تازە ئەم دیاردەیان پێوە دیارە بە تایبەتیش لای شاعیرە لاوەکانی شاری سنە و چەند شاعیرێکی دیکە،وێنەی شێعری لای من،بەرگێکی قەشەنگ و جوانە بە بەر شێعر دادەکرێ هۆنینەوەی بیرێکی بەرجەستەیە لە وشە لە قالبێکی هونەریدا ، بەڵام لە گەڵ ئەوەش دا نیم ئەم وێنە کارئیلە ئەوەندە تۆخ بێت ببێ بە پەرژینێك لە بەر دەرکەوتنی مانای شێعر ـ چونکە ئەو کاتە شێعر بە لای هێما* و رەمزەوە دەبات · کە شێعریش وای لێ بێ فەرهەنگی بۆ دابندرێ ، یا شاعیرەکە خۆی واژەی بکات، تام و لەزەتی شێعری لە دەست دەدا ، وێنەی شێعری وشە و رستە لە چوار چێوە ئاسایی یەکەی زمان دەباتە دەر کە رۆژانە خەڵك قسەی پێ دەکات ·

**پ : <u>بەم واتایەی تۆ خوێندەواران هەقیانە ئەگەر گلەیی لە شاعیران بکەن کە راستەوخۆ لە شێعرەکانیان ناکەن ؟</u>**

و : من وا ناڵێم ، چونکە پێم وایە شاعیر چەند خۆی ماندوو دەکات بۆ دۆزینەوەی وێنەیەکی شێعری جوان خوێندەوارانیش دەبێ ئەوەندە خۆیان بۆ تێگەیشتنی شێعر ئامادە بکەن ، ئاخر شاعیرێك کە بە سێ چوار مانگ بە ژانی شێعرێکەوە جینگڵ بدات و بتوێتەوە زۆر گوناهە خوێندەوار داوای ئەوە بکەن بە چەند دەقیقەیەك دەستەمۆی بکەن ، بەڵام لە هەمان کاتیش دا دەبێ شاعیر رەچاوی ئاستی تێگەیشتنی خوێندەواران بکات و ئەوەندە پێش زەمان نەکەوێ پێشم وایە هەر شاعیرێ کە شێعرێك دەنووسێ بۆ سەردەمەکەی خۆی دەنووسێ و حەز دەکات خوێندەواری زۆر بن و لێی تێ بگەن ، دیارە ئەوەش نابێتە هۆی ئەوەی شاعیر نەتوانێ نەمری بۆ شێعرەکانی دەستەبەر* بکات ، · بۆ نموونە : نالی و جزیری و خانی و مەولەوی دوای ئەو هەموو ساڵانە ئێستاش بە شەوقەوە دەخوێندرێنەوە، لە کاتێکدا هەر هەموشیان لە سەردەمی خۆیان دواون، بەرجەستە کردنی ئەم نەمری یەپەیوەستە بە کارامەیی و دەستڕەنگینی شاعیر خۆی ، کە تا چ رادەیەك دەتوانێ بە هونەرکاری بەرگی نەمری بە بەر شێعرەکانیدا بکات· واتە شاعیر دەتوانێ پردێك لە نێوان خۆی و خوێندەواران هەڵبەستێ ، بەڵام مەرج نیە هەمیشە شاعیر بە سەر ئەم پردەدا بەرەو لای خوێندەواران بڕوات ، پێویستە ئەوانیش تەقەلایەك بدەن بۆ گەیشتن بە شاعیرەکە و نزیك کەوتنەوە لە شیعرەکانی ·

**پ : <u>پێتان وایە شاعیرانی کورد لە ئاستی رووداوەکانی کوردستان دا بوون و شێعرەکانیان ئەو پار سەنگەی راگرتووە ؟</u>**

و : بە داخەوە ، زۆریان نا ، بەڵام بەردەوامیش کۆمەڵێك شاعیر لەو هەوڵەدا بوون نەکەونە ژێر چەپۆکی رووداوەکان و نەخنکێن ، زۆر جاریش خوێندەواران شاعیر بە ئامێرێکی دا دە نێن کە دەبێ کت و مت و وەکات رووداوەکان تۆمار بکەن،کە ئەمەش زیاتر ئەرکی مێژوو نووسێکە نەك شاعیر ، چونکە بەڕای من سێ جۆر هەڵوێست هەمیە :

یەکەم : پێش زەمان کەوتن ، کە ئەمەش زۆر دەگمەنە ، شاعیرێکی بەر لە روودانی کارەسات و رووداوپێشبینی یان بکات و وەك موجەمەمیەك ئەوە نیشانی خەڵك بدات ، تا ئێستا چەند شاعیرێك ئەو ئاسۆیەیان لە بەر دەم خۆیاندا دیوە ، یەك لەوانە حاجی قادری کۆیی بووە ·

دووەم : هاوکات لە گەڵ رووداوەکاندا شێعریش هاوکاری لە هەڵەنگاندن و خستنە رووی رووداوەکان بکات ، ئەمە تا رادەیەکی زۆری لە شێعری ئەمڕۆی کوردیدا بەرچاو دەکەوێ بە تایبەتیش لە شێعری بەرەنگاریدا ·

سێ یەم : رەنگدانەوەی رووداوەکان دوای روودانیان لە ناو شێعردا ئەم حاڵەتەش هەر نموونەی زۆری لێ بەرچاو دەکەوێ ، چونکە زۆر جار کارەسات و رووداوو گۆڕانکارییەکان یان زۆر خێرا و تیژرەون شاعیر فریایان ناکەوێ ، یانیش ئەوەندە گەورە و کاریگەرن هەست و بیری شاعیر دەتاسێنن ، بۆ نموونە ئێستاش لە گەڵ دابێ شاعیرانی سۆفیەتی، شۆڕشی ئۆکتوبەر و جەنگی جیهانی دووەم

کانگەی سروشتی بەرهەمەکانیاندا ، ئێمە خۆشمان لە کارەساتی بۆمباران کردنی شاری هەڵەبجە و ویران کردنی کوردستان دا هێشتا نەمانتوانیوە وەکوو پێویست لە شێعردا بەرجەستەیان بکەین ، چونکە گەورەیی و خێرایی کارەساتەکە شانی شاعیریان داهێناوە کە چی لە گەڵ ئەوەشدا هەندێ شاعیری بە توانا زۆر بە چاکی خستیانە روو .

**پ : گۆڤاری سروەتان پێ چۆنە ؟ ئایا لە ئاستی حەزی خوێنەوارانی دایە ؟ پێشنیارتان چیە بۆ زیاتر گەشە پێدانی ؟**

و : دەبێ ئەوە لە بەر چاو بگرین کە گۆڤاری سروە نۆبەرەی تەقەللا و هەوڵێکی چەندین ساڵەیە لە لە کوردستانی ئەم دیودا ، زمانی کوردی ئەو بوارەی بۆ نەرەخساوە گەشەیەکی ئاسایی بکات ، بۆیە بە کوردی نووسین ، لێرە زیاتر خۆرسك بووە دیارە کە زمانیش بنچینەی هەر نووسینێکە ، ئەم گۆڤارە ش زەمینەیەکی لە بارە بۆ مەشق کردنی شاعیر و نووسەران ، ناشبێ بەراورد بکرێ لە گەڵ ئەو گۆڤار و رۆژنامانەی لە دیوی لای عێراقەوە دەرچوون و دەر دەچن چونکە وەك کوتم زەمینەیەکی جیاوازیان هەیە بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێم گەشە کردنەکەی سروە گەشە کردنێکی ستە و لە ئاستی حەزی خوێنەران دا نیە چ لە رووی ناوەرۆکەوە ، چ لە رووی شێوە و روخساری هونەریەوە ، بایی ئەوەندەش بوار هەیە گورێکی پێ بدری و ئاستی بەرزتر بکرێتەوە ، من وای بە چاك دەزانم دەزگای سەلاحەدین کلۆرێکی فراوان بۆ نووسەر و خوێنەواران ساز بکات و گوێ لە پێشنیار و رخنەکانیان بگرێ بۆ ئەوەی لە نزیکەوە لە دەرد ی یەکتر بگەن و بە هاوکاری هەر دوو لا رەنگرێژی ئایندەیەکی چاکتر بۆ گۆڤارەکە بکەن ، هەقیش وایە دەستەی نووسەرانی سروە ، سوود لە تاقیکردنەوەکانی گۆڤارە کوردییەکانی ئەو دیوی عێراق وەربگرن ، چونکە خوێندەوارانی سروە هیوای زیاتریان بەم گۆڤارە هەیەوچاوەڕوانی زۆرتری لێ دەکەن .

**پ : راتان بەرامبەر بە زمانی نووسینی سروە چۆنە؟**

و : دارشتن و رەنگرێژی زمانی نووسینی سروە بە ناهەموار دەبینم ، چونکە زاڵ کردنی شێوە زمانێکی تایبەت خۆی لە خۆیدا کارێکی باش نیە ، ئێمە دەمێکە زمانێکی بەربڵاوترمان کردووە بە پێگەیەك بۆ نووسینی کوردی و کاری لە سەر دەکرێ،تایبەتیش نیە بە ناوچەیەکی کوردستان ، بە داخەوە هەندێ کەس بە شێوە زمانی سلێمانی دادەنێن کە وا نیە ، بەڵکوو تێکەڵاو کردنێکی ژیرانەی هەموو شێوە زمانەکانی کرمانجی باشوورە ، بەردەوامیش ، دەوڵەمەند کراوە ، تازە بە تازە ئێمە ئەوە وەلابنێین و شێوە زمانێکی تر دابێنین جگە لە شێواندنی زمانی کوردی هیچی ترمان زیاد نەکردووە ، وەك باسم کرد نووسینی کوردی خاوەن مێژوویەکی درێژە و زوربەی هەرە زۆری نووسەرانی کورد پەیرەوی یان لێکردووە ، بۆیە چاکتر وایە هەر ئەم شێوە و رێنووسە بکرێ بە رێڕەو و بنچینە ، لە گەڵ ئەوەش دام تا دەکرێ بە زاراوەی جیا ، جیا دەوڵەمەندتر بکرێ و بۆ مانایەك لە وشەیەك زیاتر بە کار ببرێ ، بۆ نموونە زۆر ئاسایی یە لە جیاتی فرمێسك ، ئەسرین و ئەشك و رۆندك بە کار بهێندرێ ، ئەمە نیشانەی دەوڵەمەندی زمانە نەك تەنگە بەری . هیوادارم دەستەی نووسەرانی سروە بە سینگێکی فراوانەوە ئەم قسانەم لێ وەربگرن .

**پ : هەوڵتان بۆ قوتابخانەیەکی شێعری تازە هەیە؟**

و : دروست کردنی قوتابخانەیەکی شێعری کارێکی سەخت و دژوارە ، چونکە بە درێژایی مێژووی کوردی ، هەر چەند کەسانێك توانیویانە خاوەنی ئەم داهێنانە بن ... یەکێك لە وانە ،(گۆران )ی شاعیرە هێشتا ئەو زەمینە لە بارەش بۆ شاعیرانی ئەم سەردەمە نەرەخساوە هەنگاو بەرەو ئەوە هەڵبێنن ، بەڵام من شێوازێکی تایبەت بە خۆمم رەچاو کردووە پێشم وایە دەنگی من تایبەتە بە خۆم و لاسایی کردنەوەی کەسی پێش خۆم نیە ، ئەمەش زۆر گرنگە ، چونکە دەبێ بە هەنگاوێك بۆ جێ پێ قایم کردنی شاعیر .

**پ : دوور کەوتنەوەتان لە کوردستانی ئەم دیو چ رەنگ دانەوەیەکی لە سەر شێعرەکانتا هەیە ؟**

و : با وەکوو من ئێرەش هەر بە وڵاتی خۆم دەزانم و پێی نامۆنیم ، بەڵام دیسان هەر لە پەنجەرەی

ژوورەکەی خۆمەوە تەماشای دەوروبەرم دەکەم و لاتەکەی خۆم خۆش دەویَ ، لە ولاتەکەشم شارەکەم ، لە شارەکەمدا گەڕەکەکەم ، لە گەڕەکەکەشم دا مالەکەی خۆمم خۆشتر دەویَ ، دیارە کە ئەو دوور کەوتنەوەیەش لە شیعرەکانم دا بە زەقی رەنگی داوەتەوە ،
ئەگەر سەرنجێکی دوا کۆمەڵە شیعرێیە چاپ کراوەکەم بدەن زۆر بە چاکی ئەم دیاردەیەی تێدا دەبینن .

**پ : پەیوەندی نێوان شیعر و مۆسیقا چۆن دەبینی ؟ بزوتنەوەی مۆسیقا و گۆرانی کوردی لە چ ئاستێکدایە؟**

و : بە لای منەوە شیعر و مۆسیقا پەیوەندی یەکی رۆحیان پێکەوە هەیە ، هەر شیعریکیش ئەگەر رەچاوی مۆسیقای ناوەوەی تێدا نەکریَ من پێم وایە کۆلەگەیەکی کەم و زیاتر بەرەو لای پەخشان دەچیَ ، دیارە کە شیعر و پەخشانیش لێك جیاوازن سەبارەت بە بزوتنەوەی مۆسیقا و گۆرانی کوردی هەنگاوی زۆر گەورەی ناوە ، بە تایبەتیش لە سەر دەستی چەند کەسانێکی لێزان و شارەزا ، بۆ نموونە : ئەنوەر قەرەداغی و دلشاد دهۆکی و برایانی کامکار لێرە رۆلێکی گرنگیان دیوە لە بەرەو پێش بردنی مۆسیقای کوردی ، بەلام بە داخەوە گۆرانی کوردی ئەوەندەی بڕ نەکردووە و هەر لە یەك قاوخ دادەخولێتەوە ئەویش بەستە بە گۆرانی بێژە تازەکان زۆر بە دەگمەن ئاوڕیان لە مەقامات داوەتەوە، فەرهەنگێکی موسیقای ئەوتۆشیان نیە پشتی پێ ببەستن. جاریَ لاو لە وحەیران وهۆرە ،خەریکن لەنا وەدەچن،ئەمەش دەبێتە هۆی کوژرانی لایەنێکی گرینگی گۆرانی رەسەنی کورد.

**پ : دەوری رۆژنامەگەری و رۆمان و چیرۆك لە کوردستان دا چۆن هەلدەسەنگێنی ؟**

و : رۆژنامەگەری لە کوردستان دا زۆر لە دواوەیە ، ئەویش لە بەر ئەوە نیە کە رۆژنامەنووس هەلنەکەوتوون ، نە خێر ، بەلکوو لە بەر ئەوەیە کە کورد هێشتا نەبۆتە خاوەن رۆژنامەیەکی خۆی ، کە تەمەنێکی درێژی هەبێ ، لە کوردستانی ئەو دیودا رۆژنامەی ( هاوکاری ) هەیە ماوەیەکە بۆتە رۆژانە ، بەلام چونکە لە ژێر سایەی رژیمی بەعس دایە ئەو ئازادی یەی بە خۆوە نەدیوە ، تا ببێتە پێگەیەك بۆ پێگەیاندنی رۆژنامە نووسانی کورد ،دلنیاشم لە وەی کە لە ناو کوردا بەهرەی وا هەیە نەك رۆژنامەیەك بەلکوو چەند رۆژنامەیەکیش بەڕێوە ببات ، بە مەرجیَ سەربەستی دەربڕین و نووسین دابین بکریَ.

ئەمەش نموونەیەك لە شیعری کاك جەوهەر

"تەمەنی ئەشق"

**گوتیان ، خۆشەویستی تۆش وەکووەمم**
**شێتانەیە وسەرت دەخوا**
تەمەنی عەشقت ، بەقەد تەمەنی ئەوپەپوولەیە
خۆی دەسووتێنیَ بۆیەك دیداری -
کەم دەرفەتی شەم
پێم گوتن خۆزگە،
**دلداری منیش وەکووچرایێ**
ئالای روونا کی هەلبکردبایا
چش لەوتەمەنەم...
بۆ وی بەخت دەکەم

* * *

گوتیان وابا وە دەزگیرانی تۆ
حەزی لەبەژن وبالای تفەنگە
گوتم تاکاتیَ
قامچی بە پشتی زامدارپێکێشیَ و
دەنگی هەتەرکا
لەگینەو... رەنگە
گوتیان ئەی بۆچی
هەر رەش دەپۆشی و
پرچی وەك بەفرە
پێم گوتن ئاخرلەم ولاتەدا
رەنگێك نابینیَ و
**خەنەش هەرکفرە!**

* * *

**گوتیان ئەوکیژە**
**بۆچی زمانی وەکوو شووژنە و**
**دل کون کون دەکا**
**گوتم: ئەوکاتەی رووی لەمن دەکا ...؟**
**گوتیان: نەخێر ، نا**
**گوتم: هەرکچێ بەدەزگیران بێ و**
**بەزۆر لەیەکتر هاوێژ کرابن**
**هەقیەتی دەمی وەکوو کوێزان بیَ**
**ئەو دەمەی کەرووی لەدوژمن دەکا !..**

**بڕوانە لاپەڕەی ٢٣**

* * *

# ناساندنی شمشاڵ ژەنی کورد

# (موحەمەد ئەحمەدزادە)

ئامادەکردنی: کەمال فەتاح قازی



**پ : تکایە بەر لە هەموو شتێك خۆت بناسێنە ؟**

و : ئەمن ناوم " محەمەد " ە و شۆرەتم ئەحمەدزادەیە و ناوی باوکم " محەمەد ئەمین " ە • بەلاّم لە بەر ئەوەیکە سوورکارەم هەر لە منداڵی یەوە پێیان کوتووم"سوورە"و ئێستاش دۆست و ئاشنایان هەر بە خاڵە سوورەم ناو دەبەن • هەر وەها جگە لەو ناوە رۆستەمیشم پێدەڵێن ، چونکە گەلێك بەسەرهاتی پاڵەوانانم زانیوە و زۆرم باسی رۆستەم و سۆهراب کردووە و لە دێهاتان بە نەقڵ بۆ خەڵکم گێڕاوەتەوە •

**پ : لە چ ساڵێکدا و لە کوێ لە دایك بووی ؟**

و : لە ساڵی*مەلا خەلیل کە بە جوانی ژمارەی ساڵەکەیم لە بیر نەماوە ، لە یەکێك لە گەڕەکەکانی شاری مەهاباد لە دایك بووم •باوکم بۆ کاری نەججاڕی چۆ ئاوایی دارە لەکی شار وێران چونکە دەست کورت بووین و لە شاری بەڕێ نەدەچ ووین • مامم کە ماڵی لە شیلان ئاوێ بوو ، هات و من و دایکمی دەگەڵ خۆی بردە دێ• ساڵێك لە وێ ماینەوە و پاشان ماڵمان چووبۆ ئاوایی سارەوانان •لەوێ باوکیشم هاتبۆ کنە خۆمان بەلاّم بە هۆی ناکۆکی یەك کە لە نێوان باوکم و دایکم بەدیهات دایکم تەلاّق درا و من کە ئێستا شیر خۆرە بووم لە دایکم ئەستاندرامەوە و وەك نەنکم دەیکوت ئەمن شیری زیاتر لە دە ژنانم خواردووە • تەنانەت نەنکم دەیکوت ژنە دۆمە کۆچەری یەکانیش شیریان داومێ • پاشان خڕیلاّنە*بوومەکە ماڵمان چۆتە قزڵجی و چوار ساڵ ماڵمان لەوێ بووە و پاشان ئەمین ئاباد •

**پ : وەك لە یادت بێ لە کێ شمشاڵ فێر بووی ؟**

و : کاتێك کە نەختێك گەورە ببووم و بەرەو مێرمنداڵی دەچووم ، ئاگام لە کاریلە و بەرخان دەبوو• هەر لەو سەروبەندەیدا دەگەڵ شمشاڵ ئاشنا بووم•پیاوێك بوو بە ناوی مام سەعید کە خەڵکی ئەمین ئاباد بوو و شمشاڵی گەلێك چاك لێدەدا • هەر کە بێ کار دەبووم و کەلێنێکم وەگیر دەکەوت دەچوومە لای و چاوم لە دەست و قامکەکانی دەکرد • ئەویش کە هەستی پێکردبوو ئەمن زۆرم شمشاڵ پێخۆشە کۆنە شمشاڵێکی خۆی دابوومێ و زۆریشی رێنوێنی کردم• بۆ خۆشم رۆژ هەتا ئێوارێ لە کن بەرخ و کاریلان هەر شمشاڵم لێدەدا و شەوانیش کە دەهاتمەوە، ئەو دەم کە هەموو دەنوستن دەستم دەدا شمشاڵەکەم و ملم لە شمشاڵ لێدان دەنا •

پیاوێکی دیکە لە ئاوایی قزڵجەی خوارێ هەبوو کە برایم شەمیان پێدەکوت و ئەویش شمشاڵی لێدەدا و هەوا*قەدیمی یەکانی زۆر بە باشی دەزانی • هات و چۆی ویشم دەکرد و لەویش زۆر شت فێر بووم • لە ئاوایی گردە بەردانیش کەریمە رەش هەبوو کە عومری لە ۹۰ ساڵ تێپەڕیبوو ، بەلاّم هەروا توند و تۆڵ مابۆوە و هەموو کارێکی

پێدەکرا • ئەویش لە فێر بوونی هەوا کوردی یەکانــدا یارمەتی یەکی چــاکــی کـــــردم •

**پ : ئێستا چ کارێك دەکەی ؟ تائێستا نەواری شمشاڵت بــڵاو کــردۆتــەوە ؟**

و : ئێستـا کە تەمەنم لە پەنجا و پێنج ساڵ زیاتــرە و



سێ کوڕ و پێنـج کچیشـم هەیـە ، بە شوکری خـودای زۆر چاك ماوم و هەموو کارێکم پێدەکرێ و ماڵیشـم لە گوندی قزلجـەیـە •

بەڵام لـە بابەت تۆمار کردنی شمشاڵەوە ئـەم کارانـەم کـردووە :

چــەنـد جار لە رادیۆ و تەلەویزیۆنـەوە لـــە دوایـان ناردووم و زیـاتـر لە بیسـت و پێنج هــەوای قەدیمیم بـۆ لێداون و چەند ساڵ لە مەوبەر هـات و چۆی ئیدارەی فەرهەنگ و هونـەریشم دەکرد و هەموو هەوایـەکی شمشـاڵم بۆ لێدەدان • ئەڵبەت ئەوانیـش مانگانەیـەکی دیاری کراویان بۆ بڕیبووەوە و دەیاندامێ • هەر وەها کاك قادر فەتتاحی ق ـازی ش پێوەنـدی دەگـەڵ گرتـووم و زۆری لــــە بـارەی شمشـاڵ و ئەو بەیتە کۆنـانـە ، بە تایبەت " خان و خانادەڵ " و " ناسـر و ماڵ ماڵ " و " برایــم و مەحمەل " و " خەجێ و سیامەند " و " لەشکـری و گوڵـە جوان " و " ئایشـە گوڵ " و " محەمەد حەنیفە " و **" حەتەم " و " شێخی سنعانی " لێ پرسیوم •**

ئەو ساڵیش لە یازدەهەمین ساڵهاتی کوماری ئیسلامی لە دوویـان ناردم بـو ئیرشادی مەهاباد و یــازدە هەوام پڕ کــردە و خـەلاتیشیـــان دامـــێ •

**پ : هیچ قسەیەکت بۆ بەرپرسانی گۆواری سروە هەیە ؟**

و : پێویستـە " ئەوەی بڵێم کە من خۆم بە یەکێك لــە موریدەکانی مامۆستا هێمنی نەمر دەزانم • جا سروەش کە دەست پەروەردەی " ئەو شاعیرە نەمرەیە هەر خۆشـم دەوێ و ڕێزی بۆ دادەنێم • قەت لە بیر ناچێ ،تا تووشی مامۆستا دەهاتم دوای تۆ خۆش و من خۆشێکـــی زۆر گـەرم دەیفـەرموو جا " سـوورە " هـەوایـــەکـــی شەپـۆلیشم بە شمشالەکەت بۆ لێدە • ڕوحی شـاد و یادی بـە خێـر بێ •

**پاشماوەی گوت و بێژ •••**

گوتیـان گەر مـردی ، لەکـوێت بنێژین  
دوانیگای چـاوت  
بە کـام دیـمەنـی رەنگیـن بڕێژیـن ؟  
دڵـدارت کـێ یـە؟  
کە تۆچاوت بۆی کردۆتـە دەریـا و  
هەزاز شـەپـۆلی نـهێنـی پـێ یـە؟  
گوتم: دڵـداروخـۆشـەویستـی مـن  
هەرهـەمـان دەشـت وداوێـن چیـایـە  
لـەوەتـی مـن هـەم  
سـایـە وسێبـەری دایکـمـی تیـایـە  
ئەو وڵاتـەیـە  
وەك ئەیـۆب کرم، دەمیـان تێ نا وە  
ساڵ بە ساڵ لەگەڵ تەمەنی خۆمدا بە کۆڵ دەیگێڕم  
هەن دەڵێن مـردووە و  
هەن دەڵێن مـاوە  
بەڵام تکایە، ئەگەر مـردیشـم لەوێ مەمنێژن  
چونکە حەز ناکەم بچمـە ژێرخـاکێ  
دوژمـن بەسـەریـاگوزەربکـات و  
خۆڵـی سـەرسینـگم  
لەژێر پۆستاڵ وچەکمەی لەشکری ئەودابژاکێ  
بەکەن بە چەپکێ پەلکەزێڕینەی مانگی بـەهاران  
لەگەڵ تیشکی خۆر بکەرێـمەوە  
جاتەماشام کەن چۆن وەك نـەمـامـێ

هەر ئەمە شیعرەیە  
لەگەڵ ئاڵادا دەشەکێتەوە.  
(جەوهەر کرمانج - عێراقی ٢-٢/٣/١٩٩٠)




# ئێمەوخوێنەر

**سنە: کاکەحامید مودەریسی گورجی**

وێڕای سڵاو نامە جوانەکەت دەگەڵ کورتە چیرۆکێك بە ناوی سامی هەلۆ گەیشتە دەستمان چیرۆکەکەت پەسندکراوە بۆبڵاو کردنەوە وجوابی پرسیارەکانت د ێرەدا دەدەینەوە· لەسەرپێشنیاری جەماوەرێك لە خوێنەران کە تۆش یەکێك لەوانی بە شی هەواری شێعر لەمەودوا بەخەتی نستەعلیق نانووسین·

"کۆترەسپی یەکەی پیکاسۆ" ناوی تابلۆیەکی پیکاسۆیە کە دەودا کۆتری ئاشتی کوژراوە و دەخوێن کەوژیوە·دەشێعری هەنگوینی شێرکۆ بێکەس دا ئەم بڕکەشێعرە :

**" هەنگی ماچیان بە خێوکرد وله لادێوه ناردیان بۆشار "** ئەوەیە کە هەنگوین بەرهەمی دێهاتە ودەچێتە شار· شاعیر دەیەوێ بڵێ لادێ کانگەی ئەوینە وعیشقی پاك (هەنگی ماچ) لە لادێوە بەرەوشاردەچێ· چونکە شار جێگەی گزە وفڕوفێڵە وبازرگانی بە هەموو شت دەکا·

**سەردەشت: سەلام کەریمی**

برای بەرێز فەرهەنگی مامۆستاهەژار بە ناوی هەنبانە بۆرینە بەرگی یەکەمی بڵاو بۆتەوە و لەکتێب فرۆشی یەکان هەیە· چاوەڕوانین بەرگی دووهەمیشی بەوزوانە بڵاوبێتەوە·لەسەرپرسیاری دووهەمەوە دەڵێین ئێمە مامۆستا کرێکار ناناسین و نازانین چ خزمایەتیەکی دەگەڵ مامۆستا هەژار هەیە· ژماری کوردەکانی سووریا لەمیلیۆنێك تێ پەڕیوە وزمانیان کوردی شیمالە یانی بە زاراوەی شیمالی(بادینی ) قسە دەکەن·

لەگۆڤاری سروەدا تائەوجێگایەی بۆمان کراوە بابەتی پزیشکی مان بڵاوکردۆتەوە و لە داهاتووش دا خودا یاربێ درێژە بەوکارە دەدەین·

**تاران: غەفوور عائیلی**

نامە جوانەکەت کەبەکوڵپەڕی وشك کراو رازابۆوە وبۆنی هەزار خۆشەویستی لێوە دەهات بە دەستمان گەیشت· قەدەرێکی زۆر تێوەی رامایین وبۆنمان کردوهەڵگێڕوەرگێڕمان کرد· سپاسی ئەوهەموو خۆشەویستی یە دەکەین وهیوادارین شیاوی ئەم هەموو خۆشەویستی یەی ئێوەبین· برای بەرێزتا ئێستا هیچ کەس شێعروهەڵبەستی خوالێخۆشبوو ئایەتوڵڵا مەردوخیان بۆ نەناردووین تابڵاوی کەینەوە·ئەگەرشێعری کوردی ئەوتان بەلاوەیە بۆمان بنێرەبڵاوی دەکەینەوە·

دەوەلامی پرسیاری دووهەمت دا کە پرسیوتە (ئایا شاعیری دەوروبەرستێکی تایبەتی هەیە یاخۆتەبعێکی زاتی و ئیحساسێکی دەروونی یە؟) هەرچەند وەلام دانەوەی ئەم پرسیارە بە بەشی(رێنوێنی ئەدەبی ) مەربووتە وئێمە دەبەشی (ئێمە و خوێنەر ) دا حەقمان نیە جوابی پرسیاری ئەدەبی بدەینەوە بەلام بەدزی ئەوان وەلامەکەت دەدەینەوە(چونکە بەشی رێنوێنی ئەدەبی بەشی ئێمەوخوێنەر ناخوێننێتەوە وئێمەش زۆرمان ئاگا لەکاری ئەوان نیە!)

بە بیروڕای ئێمە شاعیری دەپێشدا بەهرەیەکی خودا دادە و بە خوێندن ودەرس و مەشق وەدەست ناکەوێ· بەلام شێعر و شاعیری چ بەشێوەی کۆن یا نوێ بێ رێ وشوێنی خۆی هەیە· کە ئەو قانوون ورێکاوشوێنە ش بە دەرس دەرشتەی ئەدەبیات دا دەخوێندرێ· ئەوشت عەرزبکەین ئەگەر ئەوپرسیارەلە بەشی رێنوێنی ئەدەبی کردبا باش ئەوەی وتارێکی درێژیان بۆدەنووسی وناوی بیست کتێبی سەرچاوەشیان دەدایەی کەبیانخوێنیە-وە· سەرت نەیەشێنم دەبوو دووسالی رەبەق موتالابکەی بۆئەوەی بەجوابی پرسیارەکەت بکەی

هەرچەند نووسیوتە تازە هۆگری زمانی کوردی بووی نووسینەکەت زۆربێ هەڵەیە وبەراستی جێگەی ئافەریم وشانازی یەکە یەکەم نامەت بەکوردی هیچ هەڵەی تێدانیە · سەرکەوتووبی·

**مەریوان: عطی شەریفزادە**

یەکەم نامەت بە زبانی فارسی گەیشتە دەستمان· خودایاربێ نامەکانی دوایی بە زمانی کوردی دەنووسی·یانی وەك ویستووتە فێری کوردی نووسین دەبی کە زۆر کارێکی ئاسانە.زۆرپرسیارت لێکردووین کە بەژمارە وەلامەکانت دەدەینەوە·

١- ژمارەی کورد لەئێراندا بەدروستی بۆ ئێمە روون نیە· چونکە بێجگە لەکوردەکانی خۆراسان کوردێکی زۆریش دەشارەکانی سەرانسەری ئێراندا بڵاوبوونەوە· ئەگەر ژماری دانیشتوانی ئوستانەکانی کوردستان وکرماشان وئیلام هەمووبەکورد بزانین و زوربەی زۆری دانیشتوانی ئازەربایجانی رۆژاوش هەربە کورد دابنێین ئەودەم ژماری کورد لەئێراندا بەینی چوار تاپێنج میلیۆن دەبێ· دیارە ئەوە حەدس وگومانە وهیوادار-ین ژمارەی دروستی کوردەکانمان بەدەست بکا وبە ئاگاداریتانی بگەیەنین·

٢- شاری گەورەی کورد لە ئێراندا کرماشانە ، سنە دووهەم شارەو لەباری ژمارەی دانیشتوان و بەرفرەوانی یەوە ناگاتە کرماشان·

٣- ناوی شاری ورمێ واژەیەکی ئاسۆری یە بەمانای ( شاری ئاو ) ئەم ناوەلەدووبەش پێك هاتووە: ئور-ur بە مانای شار و میا mia بەمانای ئاو·

٤- ناوی مەهاباد دەپێشدا سابلاغ بوو · سابلاغ وەك دەڵێن تورکی یەو لەدووناوی

سۆوخ · (سارد) وبلاغ(کانیاو) کەهەردووکیان تورکین پێك هاتوون· هێندێك دەڵێن ئەم وازەیە لە دووبەشی ساوجی (قاضی) وبلاغ (کانیاو) پێك هاتووە کە ئەوانەش هەر دووك تورکی ئەستەمبوولین·

٥- ناوی کێوی قەندیل ئەگەر عەرەبی بێ مانای شووشە سەهۆڵ دەدا · بەلام بەبیروڕای ئێمە لەزەین بەدوورە کە ئەوکێوە ناوی عەرەبی هەبێ چونکە چیاکانی دەوروبەری( هەڵگورد - کێلەشین،کەلاز ، هەوشین ،لەند ، دالانپەر ) هەموویان ناوی کوردی ومێژوویی یان هەیە· کەوابووقەندیل رەنگە ئال وگۆڕ پێکراوی وازەیەکی دیکە بووبێ·

سەردەشت: کەریم شۆکە

دەنامە پڕسوزەکەت دابانگە هێشتنەت کردووین کە ئێمە بێینە سەردەشت وسەرتان لێ هەڵێنین·( ··· پێم خوشە لەنزیکەوە لەگەڵ ئێوە دانیشم تائێستا زۆرجاردەگەڵ خۆم دانیشتووم وگوتوومە کە بۆدەبێ بەرپرسانی سروە سەرلەئێمە نەدەن· ئاخر سەردەشتیش وەك هەموو ناوچەکانی دیکە··) بەهیوای خودا دێینەسەردشت وزیارەتت دەکەین ودەچینە ئەوشوێنانەی کەپێویستە و زیارەتی ئەوکەسانەی کە شایستەن· بەلام دەترسێین دووڕکوژی نیزیك خەساربین و ئەودەم کە هاتینە لات پێمان بڵێی" خۆزگە هەرنەمدیبایەی ،دەمدی نەمناسیبایەی!!"

کەنگاوەر : فەتحوللا مامروستەمی

برای بەرێز ،کارێکی دروست نیەئادرێس ونیشانی خەڵکی بدەین بە ئێوە یاهەرکەس · ئەگەر پێت خۆشە دەتوانی نامەبۆئەوکەسانە بنووسی ئێمە بۆیان بەرێ دەکەین·

ئیلام ، سالح ئاوا :قاسم عەبدوڵلاهی

ئەوچیرۆکەی نووسیوتە ئەگەر بەزبانی کوردی یە بۆمانی بنێرە· ئەگەرمەجەلەکەشت چەند رووپەری سپی یە دەتوانی لەوجێگایەی کرپوتە بیگۆڕیەوە·

سەقز : رەزائەمین پوور

زێوەر شاعیری بەناوبانگ ناوی عەبدوڵلا کوری محەممەد کوری مەلا رەسووڵە و خەڵکی سولێمانی یە· کڵکۆکەشی هەرلەوێ بەساڵی ١٨٧٥ زایینی لە دایك بووە وساڵی ١٩٤٨دە تەمەنی ٧٣ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە·

بانە : عەبدوسەمەد عەزیمی

بۆ وەرگرتنەوەی وەلامی پرسیارەکانت باشترە کتێبی " مێژوو ی کورد دەسەدە ی ١٩- ٢٠دا،کریس کۆچێرا "وەرکێڕانی محەممەدی رەیانی کەلك وەرگری·

لەمەڕ سیاسەتی دەوڵەتی شوورەوی بەرا - مبەر بە شۆرشی مەلامستەفا بارزانیدا دەزانین کە دەوڵەتی شوورەوی ئەوەندە ی دەتوانای دابوو رژیمی بەعسی لەدژی ئەم شۆرشە چەکدار کردوهەرچەشنە یارمەتی‌یەکی پێویستی بەورژیمە خوێنخۆرە دا ·وەك کازی شیمیایی وچەکی وێرانکەری دیکە و هەرگیز رەخنەی لە عیراق نەگرت کە ئەو چەکانە دژی کەلی مەزلوومی کورد دەکار نەکەن · تەنانەت حاشایان لەوەش کرد کە عێراق لە حەڵەبچە چەکی شیمیایی دەکار هێناوە!!!

پیرانشار: خوسرەو پەروون

برای بەرێز ئەگەر لەئیلام کەسێکت (کتێب فرۆشی - رۆژنامە یاهەرکەس ) کە نوێنەرایەتی ئێمە وەعۆدەبگرێ ئێمەئامادەین هەموو بڵاو کراوەکانی خۆمانی بۆبنێرین و هەموو یارمەتی یەکیشی پێ دەکەین·

بۆکان: حوسێن غەریبی

حەزرەتی غەوس هەمان حەزرەتی عەبدولقادری گەیلانی یە(٤٧١-٥٦١ کۆچی مانگی ) لە گەڵەپیاوانی دنیای عیرفانە و سیلسیلەی قادری دەگاتەوە ئەو· لە تەورێز و بەغدا خوێندوویەتی وپێگەیشتووە· دەکاتی خوێندندا کاریشی کردووە وبەرەنجی شان و پیلی خۆی بەرێ چووە· فتواکانی لەسەر دوو مەزهەبی شافیعی وحەمبەلی بەرێوە چووە · دەتەسەوف وفیقە دا زۆرکتێبی نووسیون وەك :(بشائرالخیرات ، طریق الحق ، الفتح الربانی والفیض الرحمانی ، فتوالغیب، ملفوظات قادریه ،ملفوظات - کیلانی) مەقبەرەی حەزرەتی غەوس لەشاری بەغدایە·

مەریوان: هەورامان عەلی تەوفیق

هیواداریین لەمەوپاش ناوەکەت بەدروستی بنووسین (هەورامان عەلی تەوفیق) برای بەرێز ئێمە بە هەموو خوێنەران ولایەنگرانی کۆڤاری سروەمان راگەیاندووە کەناتوانین وەلامی تایبەتی بەوهەموونامەیە بدەینەوە کە دەگاتە دەستمان ،چونکە ژماری نامەکان گەلێك زۆرە و ئێمەش ناتوانین تاکە تاکە جوابیان بدەینەوە وهەڵەوپەڵەی نووسراوەکا - نیان راست بکەینەوە · هیچ کۆڤارێکیش لە هیچ ولاتێك تائێستا کاری وای نەکردووە · ئێمە دووبەشمان دە سروەدا کونجاندووە بە ناوی "رێنوێنی ئەدەبی"و "ئێمەوخوێنەر " وجوابی گشتی کە بە کەلکی هەموو خوێندرانمان بێ دەدەینەوە پێویست ناکا و ناشتوانین یەکە یەکە جوابی هەموونامەیەك بدەینەوە· ئەوەش بزانە هەموو نامەکان دەخوێندرێنەوە و گوێ نادرێتە ئەوە ی نووسەر کێ یە وکوێندەری یە· بۆئەونامانەی کە هیچ شتێکی بابەتی یان تێدانەبێ وزۆرتر سلاو وئەحوالپرسی بێ دەنووسین نامەی ئەم ئازیزانەمان پێگەیشتووە و هەر ناوەکەیان دەنووسین· ئەوانەی نامەکانیان قسە وباس هەڵدەگرێ وپرسیاری ئەدەبی یا کۆمەلایەتی ومێژوویی دەکەن دەبەشی رێنوێنی ئەدەبی یائێمە وخوێنەرداجوابیان دەدەینەوە· سەرکەوتووبی·

**نامەی ئەم ئازیزانەمان پێگەیشتووە:**

**پیرانشار** : رەسووڵ جیهانی

**بۆکان:** موحسین مەزلووم، کەریم رەحیمی ، سەمەد یارمحەممەدی ·

**کرج:** ئەحمەد رەسایی ،نالی مارونی·

**تەورێز** : عەبدورەحمان زەندی·

**نەغەدە:** ئازاد باتینی

**ورمێ:** ئازاد سالح سکیری·

**سەقز** : مەحموود ئیبنولخەیات·

**مەهاباد** : ئازاد سیکاری

**مەرگەوەڕ** : جیهاد زیباری

**ئیسفەهان:** مستەفا سەلیمی بانە·



...راوکردنی جەنابی کۆنت!!



... زانایانی بە ناو بانگی کورد ...

# بنەماڵەی وەلزی

● ـ... محەمەد سەعید ئیبراهیمی .

حاج مەلاحەسەنی مودەڕیسی "مطلق" کە لەمەلاباشەکانی ناوچەی موکریان بووە زیاتر لە سی ساڵ لەجەلدیان و نەغەدەو مەهاباد تەدریسی علوومی ئیسلامی کردووە، لەساڵی ١٣٠٢ ه لەمەهاباد لەدایک بووە وله ١٣٦٦ هەتاویدا هەر لەوێ کۆچی دوایی کردووە . باسی ژیانی بابی خۆی واتە مەلاعەبدو - ڵڵای بورهانی بەم جۆرە بـــۆمن گێڕاوەتەوە .

" " مەلا عەبدوڵڵای مودەڕیسی لەساڵی ١٢٦٥ دا لەگەڕەکی رزگەیی مەهاباد لەدایک بووە.هێشتا ماوەیەك لەتەمەنی رانەبوردبوو کە بابی حاجی مەلاحەسەن مەلا و مودەڕیسی مزگەوتی قـــازی لـــە میحرابدا شەهیدکرا . مەلا عەبدوڵڵا هەربەمنداڵی لەمەدرەسەی علوومی دینی ئەو سەردەمی لەلای عولەمای پایەبەرز وەك مەلاوەسیمی سەردەشتی خەریکی خوێندن بووە و لەتەمەنی لاویدا بۆفێربوون چووە کوردستانی عێراق و بۆ ماوەی دوو ساڵان لەخزمەتی " حکمت افندی " لەشاری کەرکووك فێری عیلـــم و زانستەکانی سەردەم بووە و دوای وەفاتی مامۆستا " حکمت " چۆتە هەولێر بۆخزمەتی مەلائەبووبەکری هەولێر مەنشوور بەمەلا گچکـــە و لەوێ ئیجازەی وەرگرتووە وهاتۆتەوە لەمزگەوتی هەباس ئاغای مەهاباد خەریکی دەرس کوتنەوە وئیرشادی خەڵك بووە . دوای هاتنە سەرکاری رەزاخان بەهۆی سیاسەتی لەناو - بردنی رۆحانیەت درێژەی ژیانی لە مەهابادتووشی کیروگرفت بووە .

[illegible]

کردووە وپیاوی باسواد وەك مەلا عەبدوڵڵای بورهانیم لەعیلمی حیکمەت و کەلام لەنێویاندانەدیوە وماموستا مەلاعەبدوڵڵا لەساڵی ١٣١٥ ه لەمەهاباد کۆچی دوایی کردووە وهەر لەوێ نێژراوە .

**حاجی مەلا عەبدوڵڵای وەلزی**

حاجی مەلا عەبدوڵڵای وەلزی خەڵكی گوندی " وەلز " ی ناوچەی موکریانە ولە دەوروبەری ساڵی ١١٨٥ لەدایك بووە . لەساڵی ١٣٠٨ - هاتووە بۆ بیارە بۆلای مەلاقادری مودەڕیس .

حاجی مەلا موریدی حەزرەتی شێخ " عمر ضیاء الدین " بوو . لەعیلمی عەقڵی ونـــەقڵی مەخسووسەن "ریازی وفەلەکیات" وتقویم وعیلمی زیج وئوستورلاب ، مەهارەتی زۆری بووە ولەموکریـــان لەلای حاجی ئێلخانی بووە ولەگەڵ ئەولادی " شێخ عمر ، شێخ نجم -

الدین وشیخ علا ء الدین "پەیوەندی نیزیکی بووە ٠ ئەم زاتەپاکە لەساڵی ١٣٦٠ کۆچی ، وەفاتی کرد وسێ کوڕی لەدوو بەجێ ماوە مەلا عەلی کەباشترین مەلای ناوچەیە و مەلا حەمەدەمین کە فازیل و بەهۆش و زیرەکە ، ومەلا عەبدولڕەحمان.
" علمائیناص ٣٥٨ تالیف مەلا عبدالکریم المدرس "

**یادی حاجی مەلا عەبدوڵڵای پەسوێ**

ئەم زاتە پاکەخەڵکی پەسوێ وڵاتی شنۆ ولاجانە، پیاوێکی زۆر لەخواترس ویەکێك بووە لەمەلا گەورەکانی کوردستان بە تایبەتی لەعولوومی " ریاضیات ومنتیق، و کەلام وحیکمەتدا یەکێکەلەوانەی کەلەسەردەستی شێخ " عمرضیاء - الدین" تەمەسوکیان کردووە٠ پاش ئیجازە وەرگرتنی لای حاجی ئێلخانی لەموکریان دادەمەزرێ و زۆربەقەدرو حورمەتەوە ژیانی رادەبوێرێ ٠ فەقێ لەزۆرناوچەی کوردستانەوە روویان تێ کردووە ٠ لەساڵی ١٣٤٩ کۆچی کەمن دووساڵ بوو هاتبوومە بیارە حاجی مەلا عەبدوڵڵاش تەشریفی هاتە بیارە بۆزیارەت مەلا حەمەدەمینی کوڕیشی دەگەڵ بوو فەقێ یەکی زیرەك بوو٠ ڕۆژێکیان پێی وتم ناوێرم لەبابم پرسیاربکەم تۆپرسیار بکە مانای ئەم دوشیعرەی نیزامی چی یە ٠

**الهی طول و عرض عالمی را**
**توانی در دل مور آفریدن**
**توسعت در درون مور آری**
**نه عالم راسرمویی برید ن**

خەریکی فێربوونی فقە وتەفسیر و " اصول الفقە" بووە و دوایە چۆتە ئاوایی " چۆڕ" ی مەریوان و لە خزمەت مەلا سەیید حەسەنی چۆڕی عیلمی کەلامی خوێندووە.بۆ فێر بوونی فەلسەفەو" ریازیات " و فەلەکیات هاتۆتەمەهاباد ولە خزمەت عەلامەی زەمان خوا - لێخۆشبوو مەلا عەولای پیرەباب مامۆستای مزگەوتی عەباس ئاغا ئەو زانستانەی تەواو کردووە و ئیجازەنامەی " افتاء" وتەدریسی وەرگرتووە لەوکاتەدا محەممەدئاغای ئەمیر عەشایری کە یەکێك لە سەرۆکەکانی هۆزی مامەش بوو و نێوبانگی حاجی مەلای بیستبوو داوای نیشتەجێ بوونی ئەوی لە پەسوێ کردووە تادەرس بڵێتەوە ٠ هەتا ساڵی ١٣٢٠ کۆچی مانگی لەو گوندە ئەرکی خۆی بەئەنجام گەیاندووە٠ لەدوایە خوالێخۆشبو و مورشیدی زەمان حاجی عەبدولکە - ریمی زەمبیل ئەوی لەگوندی پەسوێ یەوە بردۆ تەزەمبیل ودوای چەندساڵ چۆتە گوندی کارێزە و کانی رەش وبەبیارمەتی ئاغایانی ئێلخانی ئەرکی تەدریس و حاشیە نووسین و تەحقیقی عیلمی بەرێوە بردووەولەدوایی تەمەنیدا چۆتە دێی تورجان و لەساڵی ١٣٤٩ کۆچی مانگی دا ، کۆچی دوایی کردووە وهەرلەوگوندەش نێژراوە ٠ عولەمای زۆرلەمەحزەری ئەوزاتە کەلکیان وەرگرتووە وەك عەلامەی زەمان مەلا سەیید حوسەین تاهیر بوغەیی ومەلاسەیید کەریم باغچە و مەلاعەلی رەبانی بوغدە کەندی ٠

**مەلاعەلی وەلزی**

مەلا عەلی وەلزی کوڕی حاجی مەلا عەبدوڵڵای وەلزی لەساڵی ١٣١٠ کۆچی مانگی لەگوندی پەسوێ لاجان هاتە دونیاو لەساڵی ١٣٤٠ کۆچی مانگی دا ، ئیجازەی وەرگرت وتەواوی " قواعد واصول "ی علوومی دینی و فقهە و تەفسیر وریازیاتی لەمەحزەری بابی فێر بوو • هەرلە زەمانی ژیانی باوکی دا دەرسی کوتووە تەوە لەعیلمەکانی بەوردی کۆلێوەتەوە وحاشیەی لەسەر نووسیون ولەدواییدا چۆتە گوندی حەمامیان وهەتا ئاخری عومری ئەرکی مودەڕیسی وەئەستۆ بووەونیزیکی سەدکەس لەعالمان لەمەحزەری ئەوما مۆستاپایەبەرزە ئیجازەیان وەرگرتووەو بەدێها - تەکانی کوردستاندا بڵاوبوونەتەوە • ئەوپیاوە زانایە لەساڵی ١٣٥٢ کۆچی هەتاوی کۆچی دوایی کردووە ولە حەمامیان بەخاك ئەسپێردراوە

**مەلا محەممەد ئەمین وەلزی**

مەلا محەممەد ئەمین کوڕی



" عسام الدین " ی ئەنباری وچەند کتێبی لەعیلمی "حیکمەت وکەلام و ریازیات وفەلەکیات خوێندووە • لەساڵی ١٣٢٤ کۆچی هەتاویدا ئیجازنامەی وەرگرتووە و چۆتە تازە قەڵای حاجی بایز ئاغای ئێلخانی زادە ودوای بەینێ چۆتە دزەی مەرگەوەر وبەیارمەتی مەلا " قطب العارفین " خوالێخۆشبوو حاجی سەیید عەبدوڵڵای گێلانی زادە هەتادوایی تەمەنی لەودێ یە خزمەتی بەعیلم و شەریعەت کردوزۆرکەس لە فەقێباشەکان لە دەرسی ئەو بەهرە و کەلکیان وەرگرت و ئیجازەدران و حاشیەی زۆری لەسەرکتێبی "منطق واصول الفقه وتهذیب الکلام و جمع الجوامع وتشریح الافلاك وربع مجیب " چەند کتێبی دیش نووسیوە •

خوا رۆحی هەمووان بەبەهەشت شادبکا

" ئامین "








# ویکتۆر هوگۆ

# هەژارەکان...



وەرگێڕلەفارسی یەوە

● رەحیم لوقمانی

ئەو شەوە شەوگارێکی زۆر درێژ بوو ·ئەوخانووچکە بەتەمەنیەی لە قەراغی دەریا هەڵکەوتبوو سەرەڕای تاریکی ، نێو خانووچکە کە رووناك بوو ·لە لایەکەوە تۆڕی ماسی گرتن بەدیوارەوە هەڵواسرابوو · لە لایەکی دیکەوە جێگاو بانێك دەبینرا · هەر لەپاڵ ئەمەدا لە سەر جێگەیەك کەلەسەر تەختە راخرابوو ، پێنج منداڵی بچووك نوستبوون · تیشکی لەرزۆکی ئاگری نێو ئاگردانەکە دا بووی لە بن میچ ، دایکی منداڵەکان کەژنی کابرایەکی ماسی گر بوو سەری کردبووە لای منداڵەکانەوە و لەبەرخۆیەوە دوعای دەکرد ·

فکر و خەیاڵی پەریشان و بەسام حەجمێنی لێ بڕیبوو · چون بەتەنیا بوو · بەوردی و دڵەکوتێوە گوێی لە هەراوزەنای دەرەوە رادەگرت · چاوەروان بوو · ترس و خۆف رووحی دەکوشی و دڵی دەهەژاند ·

لەدەرەوە لەو دیوی پەنجەرەی خانووچکەکەوە دەریای تووڕە دەیخرۆشاند · تۆفان هەموو شوێنێکی توند گرتبووە ژێر چنگی خۆی · دەریا هاواری دەکرد ولەگەڵ شەپۆلی سپی و کەفاویدا خۆی بە بەستێندا دەکوتا · لەدەنگی هاواری دەریا ، ترس و پەریشانی ، هەروەها لە نالەی تۆفانیش ، غەم و گریان هەست پێدەکرا ·

خاوەنی ئەم خانووچکەیە کابرایەکی ماسی گر بوو ·ئەو رۆژە لای ئێوارە بۆ ماسی گرتن چووبووە دەریا و هێشتا نەگەڕابۆوە · ماوەیەك بوو چنگاوەشی تۆفان ببوو و لەگەڵ شەپۆلان کێشەی دەکرد · ئەو کابرایە هەر لە سالانی منداڵی یەوە ناچار ببوو کە مل بداتە فرمانی ژیان و دەست بداتە کاری پڕخەتەری ماسی گرتن · ئەو شەوە، هەرلەمێژ بوو کەبەم ژیانە سامناك و پڕلە کێشەیە راهاتبوو · لە باران و تۆفان وکرێوە و سەهۆڵبەنداندا ، تەنانەت لە ناخۆشترین هەوای دەریادا ئەو هەر دەچوو بۆ دەریا ، دەتگوت مەرگ لە لای شتێکی هیچ بوو · هیچی پێ گرینگ نە بوو · هەمیشە لە بەر خۆیەوە دەیکوت :

" منداڵەکان نانیان دەوێ · دەجا نابێ لە تۆفان بترسێ · دەبێ بڕوێ لەگەڵ ژیان و شەپۆلی پڕخرۆشی دەریا دا وەشەڕبێنی · " ·هەمیشە بەم خەیاڵەوە ،

بەتەنیا لە نێو گەمی یەکەی دادە نیشت و رووی دەکردە تۆفان و شەپۆلی دەریای بێ سنوور .

چەندەی بێ باکی دەوێ ! چەندەی ئازایەتی و چالاکی دەوێ کە مرۆ بتوانێ خۆی بەشەپۆلی دەریا بسپێرێ و شەری لەگەڵ بکا . چەند سەختە کە مرۆ بتوانێ لەگەڵ تۆفان و دەریای پرخرۆشدا بە ربەرەکانی بکا . ئەم کارە عومرێك تەجرەبەی پێدەوێ . باهۆی بە هێزی پێدەوێ . کە تۆفان هەڵدەکا ، شەپۆل وەکوو ملر بەدەوری گەمیدا دێنە سەر . رەنگە هەر لە ترس و خۆفی بایەکە شەپۆلان هاوار دەکەن و کەفی سپی دەچێنن .

ژانی ، ژنی کابرای ماسی گر هێشتا وەخەبەر بوو . خەویشی هاتبا ، نەیدەتوانی بنوێ ، دڵە خورپە و پەریشانی مەجالی پشوودانی پێ نەدە دا . گوێی لە هاوار ونالەی تۆفانی شەو بوو . ناچار بوو بۆکەمترین وبچووکترینی ئەو دەنگانە گوێ رادێرێ . جار جار دەنگی شووم و ناخۆشی پەلەوەرانی دەریای بەرگوێ دەکەوت . ئەم هەراو هۆریا ، مێردەکەی دەهێنایە بەر چاوی ، کەلە گەمی یەکەی دانیشتووە و بە نێو شەپۆلی سامناکا دەچێتە سەرو دێتە خوارەوە . ژانی سەری کردبوە لای منداڵەکانی یەوە چووبوە ناخی پەژارەو بێ دەنگی .

لە دڵی خۆیدا بیری دەکردەوە ، **" ژیانی هەژاری و دەست تەنگی چەند سەختە . چنگاوەش بوونی بێ پووڵی و نەداری چەند دژوارە ؟ هێشتا ئێمە سەرەڕای ئەم هەموو رەنج و سەختی یە هەرنانی جۆ دەخۆین وبەس . هەموو خێزانی ئەم ماڵە پێ خاو سن ، دەبێ سەرتا سەری ژیان وابن ؟ لە بەر چی ؟ ".**

تۆفان توندتر دەبوو . دەریا دەیلەرفاند و شەپۆل هەردەم وەکوو کێو بە سەرکەنارا دەرووخان . لە نێو هەور ومژی دەریادا جار جار ئەستێرەیەك دەبر - یسکایەوە . هەروەك پریسکی کوورەی ئاسنگەرێك کە لەنێو دووکەڵدا دەدرەوشێتەوە و ون دەبێ ، ئەم ئەستێرەش خێرا بزر دەبوو .

نیوە شەو بوو . حەتمەن لەو کاتەدا بەختیاران و سامانداران بەکەیف و خۆشی یەوە خەریکی عەیش و نۆش و بەزم وهەڵپەڕین بوون . بەڵام هەر لەم کاتە دا کابرایەکی ماسی گر لە چ حاڵدا بوو ؟

ئەو هەژاری بێ ئەنوا بارانی یە چەرمەکەی کێشابوو بەسەر خۆیدا و لە تاریکی و مژی بێ پایانی شەو دا چاوەنواڕی چارە نووس لە نێو گەمی یەکە ی دانیشتبوو پەیتا پەیتا دەچووە پێشەوە ، بەڵام هەتەرێك لە بەستێن نەبوو . لە بەر خەیاڵی ژانی ئەم ژنە هەژارە گەلێ دیمەنی سامناك و ناخۆش یەك لەیەك خراپتر دەهاتنە بەر چاوی و غەم و حەسرەت دڵی دەکوشی . فرمێسك بە چاوانیا دەهاتە خوار ، بێ ئەوەی ئاگای لەخۆبێ ئەم چەند وشەی بەلێوی لەرزۆکەوە دووپات دەکردەوە . ، **" خودایا چەندە ها ماسی گری تر کە لەبن دەریا دا نوستوون ، هەموویان لە شەوێکی وەك ئەمشەودا رۆیشتوون و ئیتر نەگەڕاونەتەوە . "**

ژانی چرایەکی هەڵگرت ، بیری کردەوە ، کاتی ئەوە هاتووە کە بە پێشوازی مێردەکەیەوە بڕوا . لە دڵی خۆیدا دەیگوت : **" ئەرێ دەریا هێشتا ئارام نەبۆتەوە ؟ رەنگە هەوای روون کردبێ و تۆفانیش رق و قینی خۆی برێك دامرکاندبێ . دەبێ بڕۆم بزانم بورجی د یدەوان رۆشنە ؟ "**

ژانی لەماڵ دەرکەوت هێشتا زۆری بۆبەیان مابوو . مژێکی تاریك سەرتا سەری دەریای داگرتبوو . دەریا وەك پێشتر بگرە توندتر دەیخرۆشاند . بارانیش دایکردبوو . ژانی بەئاستەم وەکوو کوێران دەڕۆیی . لە پڕێك گەیشتە خانووچکەیەکی تاریك . ئەم ماڵە لە نێو تاریکاییدا هەر دیار نەبوو . نەچرایەکی تێدا هەڵکرابوو . نە شەوقێك تێیدا بەرچاوان دەکەوت . گژەبا بەکەلێن وکونی بانەکەیدا وژە وژی دەکرد و دەیهاژاند ، لەوانەبوو هەر بەجارێ ماڵەکە هەڵکەنێ .

ژانی قەدەرێك راوەستا . تێ فکری گوتی **" ئەمە ماڵی جیرانە نەخۆشە کەمانە . ئەوژنە هەژارە لە شەوێکی ئاوادا لەم هەراو هوریایە دا تەنیایە . دەبێ بڕۆم بزانم هیچی پێویست نیە ؟ خەیاڵی ژیانی تاڵ ، بەتەواوی ئەوی لەبیرم بردبۆوە . مێردەکەم دوێنێ دەیگوت ، زۆر نەخۆشە . دەبێ حەتمەن بیبینم . " .**

ژانی بەتوند لە دەرکەی دا . جوابێك نەبوو . لەبەر خۆیەوە دەیگوت ، **" دڵم بۆی دەسووتێ ، هەژارە ، لە ئێمە هەژارترە . منداڵەکانی بێ کەس وبێ باوکن . حەتمەن هیچیشیان نیە بیخۆن . تەنیا هەژارەکان**

بلّیان بۆیەك دەسووتیّ " . ژانی لە دەرکەی دەدا و بانگی دەکرد ، تابەڵکووکەسێك دەنگی ببیستێ و دەرگاکەی بۆبکاتەوە . بەلاّم دەنگی لە نێو هەرا و هوریای تۆفاندا ون دەبوو و وەلاّمێك نەدەهات . کەبە توندی لە دەرکەی دا لە پڕێك دەرکە خۆی کرایەوە ،

ژانی چووە ژوورەوە و تیشکی زەردی فانۆسەکە ماڵەکەی روون کردەوە . بەلاّم هەر لە یەکەم هەنگاودا سام گرتی و وشك راوەستا . ژنەی دراوسێ یان لە گۆشەیەکی ماڵەکەدا کەوتبوو . لاقی نووشتابۆوە و زاری بڕێك کرابۆوە . رووحی ئازار گەستەی دەرچووبوو . لەهەمو و ژیانی ، پاش ساڵەها شەڕو کێشە لەگەڵ هەژاری و نەداری هەر ئەمجەستە ساردە بەجێ مابوو . لە پاڵ ئەم لاشە ساردە دا ، دوومنداڵەکەی لە خەوێکی شیرین وخۆشدابوون . دایکیان کاتی نووستن رووپۆشە دراوەکەی خۆی کێشابوو بە سەریاندا تاسەرمایان نەبێ .

پاش قەدەرێك ژانی هاتە دەرەوە . پەتوویەکی پێچا بۆوە و بەباسکی لاوازی بەزەحمەت بۆماڵی دەبردەوە . بەلاّم کەوتبووە ترس و دڵە خورپەوە ! ....

پێی دەلەرزا و بەترسەوە سەرنجی دەورو بەری خۆی دەدا ! کە گەیشتە ماڵەوە ، کەناری دەریا وردە وردەلە نێو تەم و مژەوە دەردەکەوت ... ژانی رەنگ بزرکاو و پەرێشان لەسەر چوارپایەیەك لای جێگەکە دانیشتبوو ، هێشتا چاوەڕوانی مێردەکەی بوو . دیسان غەم و پەژارە دایگرتەوە . ئەوەندەی نەمابوو لە غەم و حەسرەتدا دڵی بتۆقێ . لەبەینی لێوانی یەوە لەسەرخۆ چەند کەلیمەیەکی ناتەواو دەهاتە دەرەوە . لەبەر خۆیەوە دەیگوت :

**" ئەمە چ کارێك بوو کردم ؟ شووەکەم خۆی دەرد و غەمی کەم بوو ؟ بۆنانی من و پێنج منداڵەکەم ئەم هەموو رەنجەی دەکێشا . ئێستا ئەمانیش پێ زیاد بوون . خودایا ، وەك شتێك ، مێردەکەم هاتەوە ، نا ، بە خەیاڵمدا هات . وادێتە بەر نەزەرم . کەس نیە . چ رۆژگارێکی خراپە . خۆمان هیچ نیە بیخۆین کارێکی باشم نەکرد . بەلاّم چار نەبوو . حەتمەن شووەکەم لێم دەدا . دەزانم کە شایستەی لێدانم . وەك شتێ هاتەوە ! نا ، دەنگی بایە . خودایە من چەند گەوجم ئەم شەو یەکسەرە چاوەڕوانی ئەو بووم ، کەچی ئێستە لە هاتنەوەی دەترسێم ! "**

ژانی شەکەت وماندوو سەری نایە بان دەستی و بەخەمەوە خەوی لێ کەوت .

ئێستا ئیتر هاژە و ناڵەی دەریا و گژە با نایە . لەپڕێك دەستێکی بەهێز درگاکەی کردەوە . روونا کایی کەم رەنگ و جوانی دەم بەیان لە شانی درگاکەوە دای لە ژوورە کە و لەگەڵ ئەم رۆشناییەدا کابرای ماسی گر هاتە ماڵەوە . وبانگی کرد " **ئەوە هاتمەوە !**"

ژانی وەخەبەر هات و بەخۆشی یەوە لەجێ راپەڕی . لێوی نایە سەر بارانی یە زبر وتەڕەکەی و رایمووسی . مێردەکەشی باوەشی پێداکرد و چاوی بڕی یە نێو چاوانی . ژانی بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی : **" گیانەکەم ئاخری هاتیەوە ؟ چۆنی ؟ نێچیرت گرتووە ؟ "** ماسی گر گوتی :

**" راو نەبوو . سەوڵەکە لەدەستم دەرچوو . تۆڕەکە-شم دڕا ، ئەوەندەی نەمابوو تێدابچم . چارنیە ؟ چارێ بلّێ بزانم منداڵەکان چۆنن ؟ هەوای چەندە ناخۆشە . وەختە بوو بخنکێم . چەند جارێك کەوتمە گەرووی مەرگەوە . ئەدی تۆ بێ من چیت دەکرد ؟ "**

ژانی گوتی :

**" چاوەڕێی تۆ بووم . بڕێکیش درووما نم کرد ، لە ترسانا لەوانە بوو تۆق بکەم . زۆرنیگەرانی تۆ بووم . ئەو دەریا هەر دەیخرۆشاند منداڵەکان باشن ، ئەمری دەزانی شتێکی ناخۆش رووی داوە ؟ من دەمەوبەیان چووم بۆماڵی هاوسێ کەمان ئەو بێچارە دوێ شەو مردووە ! منداڵەکانی تەنیا و بێ کەسن "** ژانی هەزار کە ئەم قسانەی دەکرد لە غەم و نیگەرانیدا رەنگی تێك دەچوو .

نەیدەتوانی قسەکانی رێك و پێك بکا . لەکوتەك دەترسا . دەتگوت کارێکی خراپی کرد بوو . دیسان گوتی : **" زۆر منداڵن کچە گەورەکەی تازە کەوتۆتە سەرپێ "** . کابراکەوتە فکرەوە ، ئینجا گوتی : **" ئای لە و هەزارانە ! چ رووداوێکی ناخۆشە حەتمەن لەبەین دەچن کێ بە خێویان بکا . خەڵکی ئەم گوندە**

بڕوانە لاپەڕەی ٦٢

# پێشڕەوتی زانست

تەنزی کۆمەلایەتی





دیاری: سەلاح نووری.

حەز لە چارەی خاڵم ناکەم چونکە مرۆڤێکی رژدوچرووکە ئیش و کاری زۆر چاکە..بازرگانە! بەلام جۆرێك دەژی و هەمیشە دەکرووزێتەوە خەڵکی وا دەزانن حالی ئەوەندە چاك نیە وهەموو سامان و دارایی یەکی هەر ئەومالە بچکۆلە و دووکانەکەیەتی..

خاڵم سواری ئوتۆمبیل نابێ.. جل وبەرگی کۆن وهەرزان دەپۆشی لە کرینی شت ومەك وپێویستی ماڵ وخێزان زۆر بەرچاو تەنگ و چرووکە و ئەگەر دوچاری ئەو نەخۆشی یە مەترسی دارە نەبوایە هەرگیز نەماندەزانی ئەوەندە پارەو پوولی هەیە.

کاتێك نەخۆش کەوت گرێی توورەکەکەی شل کردەوە وزۆر بە دڵ فراوانی بەوە پوولی دە ئاخنیە گیرفانی دوکتۆرەکان. ئەوکاتە بۆمان دەرکەوت. هەی ،هەوو ، نەخۆشی یەکەی خاڵم هەروەکو کارەکانی تری سەرسوڕهێنەربوو...

یەکەم جار ورگی لە نێوان ناوکی وپشتی ئازاری دەدا. دکتۆرەکان هەرچی سەیریان دەکردو ئەم دیوو ئەو دیویان دەکرد سەریان لێ دەرنەدەکرد و نەیاندەزانی نەخۆشی یەکەی چیە..بەتایبەتی خاڵۆیشم خۆی نەیدە توانی وەسفی نەخۆشی یەکەی خۆی بکا. بۆ نموونە دەیوت ئەڵێی لە سکما دە سەگ و پشیلە کەوتوونەتە کیانی یەکتروشەڕە سەگ وپشیلەیە. دوکتۆرەکانیش بەم قسەیەی خاڵۆم پێدەکەنین.ناحەقیان نەبوو ورگی مرۆڤ خۆ کونە سەگ و پشیلە نیە لەوێ کۆ ببنەوە ولووورە لووره ومیاوە میاویان بێ. خۆزگە نەخۆشی یەکەی خاڵۆم ئەم شتە بوایە کە خۆی دەیوت. چارەکردنی کارێکی زۆر گران نەبوو. کرێکار - ێکی شارەوانی کەمێ گۆشتی ژاراوی دەرخواردی خاڵم دەداو کاری سەگ وپشیلەکانی تەواودەکرد وخاڵیشم چاك دەبوویەوە..

دکتۆر نەما خاڵم نەچێتە لای. بەلام کەسیان سەریان دەرنەدەکرد لە نەخۆشی یەکەی خاڵۆم.. پاش ماوەیەك بیستمان لە دەرەوە پرۆفیسۆرێك هاتووە، خاڵمان هەڵگرت و گەیاندمانە خزمەت پرۆفیسۆر. پرۆفیسۆر پاش ئەوەی بە وردی سەیری خاڵۆمی کرد وتی: ئەمە نەخۆشی تیراویێ بەتی (خنازیر) جێگاکەشی لە گەدەدایە (معدە) وهیچ پەیوەندی یەکی بە ورگەوە نیە. نزیکەی نیو سەعاتێك سەبارەت بە ریخۆڵە و ورگ وگورچیلە وپەنکریاس و ناوبەنجلۆ قسەی کرد. لە کۆتایی دا پرۆفیسۆر وتی: گەدەی خاڵۆت هەڵخلیسکاوە و۳( سانتیمتر) لە شوێنی خۆی دەرچووە وشۆڕبۆتەوە ودەبێ هەرچی زووتر نەشتەر کاری بکرێ...

دەست بە جێ خاڵۆمیان لە نەخۆشخانە خەواند ودوای سێ رۆژ نەشترکاری کرا. بەلام چانەبۆوە. نازانم راست یادرۆ بووئافرەتێك کە لە بەر دەستی پرۆفیسۆر ئیشی دەکرد ولە زووری نەشتەرکاری دا بوو وتی: کاتێك پرۆفیسۆر ورگی خاڵۆتی هەڵدری.گەدەی خاڵۆت ساغ و هیچی نەبوو دکتۆرەکە واقی وڕمابوو وتی تاکوو ئێستا گەدەی بەم ساغیەی نەدیوە. بەلام لەبەر ئەوەی ورگی هەڵدڕی بوو نەشتەر - کاری یەکەی ئەنجام بدا و پارە وەرگرێ نیوەی گەدەی بڕی.ئێمە هەرچە ندە هەراوهوریامان کرد و بە پرۆفیسۆرمان وت:

بۆچی گەدەی ساغت بڕیوە بەڵام

پرۆفیسۆر مێشێ میوانی نەبوووتی: راستە ئێستەگەدەی ساغە بەلاّم پاش ماوەیەکی تر تووشی تیراو یَ دەبیَ.

خالۆمان هەڵگرت وهێنامانەوە بۆماڵەوە. هێشتا برینی تەقەڵەکانی سارێژ نەببوونەوە دوچاری ئێشێکی زۆر سەخت بوو. دیسان ناچار بووین بیبەین بۆ لای دوکتۆرێکی تر، ئەیانوت ئەوەندە شارەزایە هەر مەپرسە. لەراستیدا دکتۆرێکی چاکیش بوو. هەرکە خالۆمی چاو پێکەوت دەست بەجێ زانی گورچیلەکانی لەکارکەوتوون ونەخۆشی یەکەی دۆزی یەوە و پێویستیشی بە ئەشاعە نەدەکردوتی: دەبێ هەرچی خێراتر کورچیلەکانی نەشترکاری بکرێن.

بۆ جارێکی تر ورکی خالۆمیان هەڵدڕی. دکتۆری شارەزا بەبینینی کورچیلە ساغەکانی خالۆم سەری سورمابووکە تاکووئێستاکورچیلەی بەم ساغیەی نەدیوە. بەلاّم دەبێ یەکێك لە کورچیلەکان دەربهێنرێن وتیان: دکتۆر چۆن دڵت دێ ئەم کورچیلە ساغە نەشتەرکاری بکەی؟ "ماشاء الله" ئەڵێی سەعاتەئیش دەکا. بەلاّم دکتۆری شارەزا هیچ کوێی نەدایەووتی:

رۆڵە کیان ئێوە بۆچی تێناگەن ئەگەر ئەم کورچیلەیە دەرنەهێنین ئەوان باوەڕ ناکەن کە نەشتەرکاری کراوە و وائەزانن بەخۆڕایی پارەکەیان لە کیس چووە ئەبێ کورچیلەیەکیان دەربێنین تاوەکو بەڵگەیەکمان بە دەستەوە بێ. هەر چۆنێك بوو کورچیلەیەکی خالۆمیان دەرهێنا وبە تەنیا گورچیلەیەکەوە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە وڕۆژێ هەزار جار شوکری خوای دەکرد کە لەژێر نەشتەرکاری دا نەمردووە. بەلاّم رۆژ لە دوای رۆژ خالۆم ئێش و ئازارەکەی قورس تر دەبوو. یەکێ لە خزمان وتی: من ۱۶ جار نەشتەرکاری کراوم و هەموو کیانم جێگای نەشتەروتەقەڵ و دورینەوەیە بەلاّم چاك نەبوومەوە تاکووچوومە لای دکتۆرسەلیم ئەو چاکی کردمەوە ...

دەست بە جێ خالۆمان هەڵگرتو کەیاندمانە لای دکتۆر سەلیم. کاتێ کارەساتەکەمان بۆ باس کرد. دکتۆر پێکەنی و وتی: ئەوان دەردی تۆیان نەدۆزیتەوە. ریخۆڵەکانت پێچیان خواردووە. بەر لە خالۆم من باوەڕم بە قسەکەی دکتۆر کرد. چونکە خالۆم ئەوەندە بەرچاو تەنگ بوو لەوانەبوو ریخۆڵەی خۆی کرێ دا بێ ...

بۆ جاری سێ هەم ورکی خالۆمیان هەڵدڕی. دکتۆرکە ریخۆڵەساخەکانی خالۆمی چاوپێ کەوت واقی وڕما ونەشتەروکەرەستەکانی بەجێ هێشت وخەریکی تەماشا کردنی ریخۆڵە ساغەکانی خالۆم بوو. دەیوت ئەمە چ ریخۆڵەیەکە. تاوەکوو ئێستا ریخۆڵەی وادرێژم نەدیوە. کاتێ دکتۆرکریێ بەرچاو نەکەوت وتی:

ئێستا کە ورکیمان هەڵدڕیوە چاکتروایە کەمێك لە ریخۆڵەکانی ببڕین. لە دوای ئەم نەشتەرکاری یە نەخۆشی یەکەی خالۆم قورس تربوو. لە رۆژنامەیەك دا خوێندمەوە کە دکتۆرێك خوێندنی لەئەلمانیا تەواو کردووە و چەند ساڵێك بەڕێوەبەری نەخۆشخانەیەکی ئەلمانی بووە ئێستا گەڕاوەتەوە بۆ وڵات ولە ئەنقەرە عیادەی کردۆتەوە. بە هەزار چەرمەسەری خالۆمان گەیاندە ئەنقەرە. دکتۆرەکە کە شەهادەی لە ئەلمان وەرگرتبوو. بەسەر هاتی خالۆمی بیست وماوەیەك تەماشای کرد ولە پاشان وتی: دکتۆرەکان نەیانتوانیوە نەخۆشی یەکەی خالۆت بدۆزنەوە. ئەم نەخۆشی یە لە گورچیلە دایە دیسان جارێکی تر ورگی خالۆمیان هەڵدڕی. بەلاّم گورچیلەی چی.. ئەوەندە ساغ وپاك و جوان بووهەر مەپرسە. بەلاّم خۆ هەربە خۆڕایی ناکرێ ورگی بدورنەوە ریخۆڵە کوێرەی خالۆمیان دەرهێنا ...

لە پاش ئەم نەشتەرکاری یە نەخۆشی یەکەی خالۆم چەند بەرابەر زیادی کرد. هەرکەسێك بیوتایە لە فلاّنە جێ دکتۆرێکی چاك وشارەزا هەیە خێرا خالۆم خۆی ئەکەیاندە لای. بەلاّم هیچ سوودێکی نەبوو. من ئێستاش سەرم سوڕماوە نازانم پیاوێکی چرووك و بەرچاو تەنگی وەکوو خالۆم کە پارەکانی بە دڵ وگیانیەوە نووساندبوو ئێستا چۆن بەو دەست بڵاویە پارە دەداتە دکتۆرەکان تەواوی ئەندامەکانی لە شی نەشتەرکاری کران. هەرئەندامێکی دوان بوایە دانەیەکیان لێ دەر ئەهێنا هەرشتێك درێژبوایە لێ یان دەبڕی وکورتیان دەکردەوە و ئەوانەیان بەکار نەدەهاتن فڕێ یان

دەدا ...

وەزنی خالۆم ٦٠ کیلۆ بوو لە پێش نەشتەرکاری دا . بەلام ئەوەندە ورگ وریخۆلەیان دەرکرد بوو بە ٣٨ کیلۆ وهێشتا هیوا براونەبوو ە هەرکەسێك بیوتایە لە فلانە شوێن دکتۆرێکی چاك هەیە . بە هەڵە داوان خۆی دەگەیاندە لای . ئەمجارەیان چووە لای دکتۆرێکی خارجی دکتۆر لە پاش ئەوەی بە سەرهاتی خالۆمی بیست . بزەیەکی کردو وتی: زۆر بەداخەوە هەموو لەشیان بە هەڵە نەشتەرکاری کردووە . تۆ نەخۆشی لەوزەت هەیە . لە جیاتی خالۆم من دەنگم هەڵبری و وتم: دکتۆر ئاخر خالۆم نەخۆشی - یەکەی لە بەینی پشت وناوکیەتی ئیتر لەوزەی چی ؟دکتۆر بەتوورەیی- یەوە و لامی دامەوە ووتی ، ئەگەر من دکتۆر بم خۆم دەزانم . رۆڵە گیان لە لەشی خالۆت ئەندامێك نەماوە نەشتەرکاری نەکرابێ بێ گومان نارەحەتی یەکەی بە هۆی لەوزەیەتی . ئەمانە نەشتەرکاری دەکەم ئەگەر چاك نەبوو تەکبیرێکی دەکەین . لەوزەی خالۆمیان دەرهێنا بەلام ئێش وئازارەکەی چاك نەبوو .

لەشی خالۆم ئەوەندە هەڵیان دڕی ودوریانەوە وەکووتۆڕی ماسی گری لێ هاتبوو . بەوشێوەیە دکتۆرەکان ئیتر پێویستیان بەوە نەبوو لە کاتی نەشتەرکاری دا سوودلە کەرەستە تایبەت مەندی یەکانی نەشتەرکاری وەرگرن ،هەرئەوەندە بەس بوو کە تەقەڵەکانیان دەردەهێنا وورگی خالۆم وەکووسفرە دەکرایەوە ئەمە بە قازانجی خالۆشم بوو . چونکە ئیتر وەکوو جاران ئێش و ئازاری نەبوو . تەنانەت کە بە توندی دەکۆکی تەقەڵی نەشتەرکاری- یەکانی هەڵدەوەشایەوە .

خالۆم هەموو کاتێك دەیوت ...

نازانم بۆچی خوای گەورە لەشی مرۆڤی هەرلە کونی سەرەوە تاوەکوو کونی خوارەوە وەك یەك دروست نەکردووە تاوەکوو دکتۆرەکان بە ئاسانی دەستیان بکردایە بەورگی مرۆڤ دا وهەرچیەکی تیا بوایە دەریان بهێنایە هەروەهادەیوت جگە لە مردن چارەیەکی ترنیە . بەلام خەڵکی وازیان لێ نەدەهێنا و هەر رۆژێ ناوی دکتۆرێکی تازەیان پێ دەوت . ئەرك ومەینەتی من رۆژ بە رۆژ زیاتر دەبوو . هەرجارێ بە هەزار چەرمەسەری خالۆم بە کۆڵەوە دەکرت ولەم دکتۆردەمبرد بۆلای ئەو دکتۆر . ناردمان لیستی دکتۆرەکانمان بۆرەوانە بکەن لە وەزارەتی تەندروستی (بهزیستی ) یەوە .

لیستەکەیان بۆ ناردین.سەیرمان کرد تەنیا دوو دکتۆر ماوە کە خالۆم نەچۆبێتە لایان. دیسان خالۆمان برد بۆ لای یەکێك لە دکتۆرانە.دکتۆر هەربە بیستنی بەسەرهاتی خالۆم چاوی پەڕی یە تەوقی سەری و واقی وڕما کە چۆن لە پاش ئەم هەموو نەشتەرکاری یە ماوە ونەمردووە، بەداخێکەوە وتی:

هەرچی کراوە هەمووی بێ سوود بوە. نەخۆشی یەکەی بە هۆی دانەکانیەتی ،بە هیوای چاك بوون هەموو دانەکانی خالۆمیان کێشا . بەلام هیچ سوودێکی نەبوو و لەمەش خراپتر نەیئەتوانی خواردنیش بخوا . زۆر لاوازوبێ هێز بوو . رۆژێك خالۆم وتی دەمەوێ هەرچی پارە وپووڵێکم ماوە بیدە م بە دکتۆرێکی خارجی ...

لەگەڵ خالۆم بە هەزار چەرمەسە- سەری رویشتین بۆ پاریس. لەبەر ئەوەی لەوێ کەسمان نەدەناسی و شارەزاش نەبووین. هەرکەچاومان بە تابلۆی دکتۆرێك کەوت خێرا چووینە ژوورەوە . دکتۆر بەورد ی گوێی لە قسەکانی ئێمە گرت و لە پاش سەیرکردنی تەواو وتی .. تۆ هیچ نەخۆشیەکت نیە. تەواو ی ئەم نەشتەرکاری یانە بێ سوود بووە. لەمەود وا پشتێن ( کەمربند ) بە پاتۆڵەکەتەوە مەبەستە وسوودلە بەندی سەرشان وەرگرە. ئەم ئامۆژگاری یەی دکتۆرمان ئەنجام دا . تەواوی نەخۆشیەکانی خالۆم چاك بوونەوە ودەردونارەحەتی نەما .

لە پاریس گەراینەوە.خالۆ م هیچ نەخۆشی یەکی نەبوو.تەنیا خەفەتی ئەوە بوو کە ئەو هەمو و پارەیەی داوە بە دکتۆرەکان وهیچ سوودی نەبووەوزۆر رەنجی کێشا تاکوو لە پاش هەش مانگ قەزا و بەلای ئێوەی برد .

نەمانزانی لە بێ پارەیی مرد یان بە هۆی ئەو هەموو نەشتەرکاری- یە کە نیوەی لەشیان بڕی ودەریان هێنا .

ئەوەندە دەزانم هیچ مرۆڤێك بەرگەی ئەو هەموو نەشتەرکاری یانە ناگرێ وماوەیەکی زۆر ناژی...



# قەڵای کەرەفتوو

«عومەر فاروقی»

**ش**وێنەواری مێژوویی هەرگەلێك نەك تەنیا بەڵگە وپێناسی ئەو گەلەن بەڵکوو لە مێژووی شارستانیەت وفەرهەنگی هەمووگەلانی جیهاندا جێگای تایبەتی وڕێزوحورمەتیان هەیە. چونکە کۆمەڵ وجەماوەری خەڵکی بە وێنەی یەك ئەندامن وهەروەکوو زاناوهەستیاری گەورەی ئێران سەعدی شێرازی فەرموویەتی بەنیادەم هەموویان وەکوو گەوهەرێکی تاقانەوان، جائەگەر ئێمە ئەندامانی کۆمەڵگای ئینسانی بە یەك ئەندام بخەینە بەرچاو دەبینین کە هەموو لە چاوگوێچکە لاق ،دەست ،قەلب وگورچیلە و۰۰۰۰۰۰ پێك هاتوون وهەر بە پێی ئەم لە بەر چاوگرتنە دیرۆك وشارستانیەتی وڵاتەکان وگەلانی جیهان لە دەیان شتی گرینگ وباش پێك هاتوون کە بە کەلکترین وسەرنجڕاکێشترین وعیلمیترینی ئەوانە هەر ئەو شوێنەوارە مێژووییانەن کە لە پێشینیان وەکوو میراتێکی فەرهەنگی بۆئێمە بە جێ ماون ئێمەش بە پێی داب ویاسا و رادەی زانستی خۆمان بۆداهاتوانی بە جێ دێڵین.

شوێنەواری مێژوویی ئەمڕۆ بە زۆر شت وەکوو:

قەڵا، ئەشکەوت، گۆڕستان باڵاخانە،عەمارەت، پەیکەرە، بەردی هەڵکەندراو، کتێب و نووسراوەی کۆن وهەمووئەو شت ومەکەی بۆژیانی مرۆڤ پێویستن وەکوو: کاسە، دەوری قەدەح،گۆزە خومرە وجەڕە و۰۰۰۰ دەگوترێ۰

دیارە کوردستانی هەرە کۆن وەکوو سەرچاوێکی ناسراوی شارستانیەت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا دەبوا زۆر زۆرلە باری شوێنەواری مێژوویی دا دەوڵەمەند بێ، بەڵام هەر وەك بەڵگە کۆنەکانی مێژوویی ئەم ناوچەیە دەیسەلمێنن؛

قەڵاوبارەگاوشاروگوندی کوردستان بە درێژایی مێژوولە بەر هێرشی داگیرکەران و چەوسێنەراندا بووە وزۆربەیان لە نێوچووە ولە جێگایان چەند تەپۆلکی خۆڵەمێشی بە جێ ماوە۰

ئێستا لە کوردستانی ئێراندا سەدان تەپۆڵکە لەو تەپۆڵکانە وەکوو: دەورە قەڵا، حەسەنلوو کانی نیاز، خەیدەر، بوگەبەی کۆنتەپە وفەلاگا هەن کە دەوری شارەکوردنشینەکانیان گرتووە بە تایبەت قەڵاکانی زێوییە، کەرەفتووتەختی سولەیمان هەروا لە ناو دڵی زامار ی خۆیاندا بەڵگەو پێناسی شارستانیەت وتەمەدونی گەلی کوردیان داشاردووە وکەس نابیندرێ کە دڵسۆزانە هەڵیانکۆڵێت وبە چاوی تەماعیان لێ نەڕوانێت۰ بەڵکوو ئەگەر ئەو کارەش کراوە،تاقمێکی لێ نەزان وخۆفرۆش وگەلفرۆشی سەربە بێگانە بۆ ماڵی دونیایە وتاڵان وتاراج زۆربە نامەردانە باسکیان لێ هەڵماڵیوە وبە پاچ وبێل وقولەنگ هەموو ئەو شوێنەوارە گرانقیمەت وگرنگانەیان تێك رووخاندووە تاشتێ پەیداکەن وبیفرۆشن ۰ هەربۆیە ئێستا زیاتری موزەکانی ئاسەواری مێژوویی وڵاتانی داگیرکەروزۆردار تەنانەت

مووزەی فەلەستینی داگیر کراویش بە ئاسەواری تاریخی ولاتانی وەك ولاتی ئێمە رازاوەتەوە. ئەلبەت ئەم مەبەستانە بۆخویان ،دەردێکی گران و بارێکی قورسن کە لێدوان ولێکۆلینەوەیان بۆخۆی حەفتا مەن کاغەزی پێویستە، بەلام مەبەستی من پاش ئەم پێشەکییە ناساندنی یەکێ لە مێژوویی ترین وگرینگترین شوێنەوارەکانی کوردستانی ئێرانە، ئەویش قەلای کەرەفتوویە.

قەلای کەرەفتووواله ۶۵کیلۆ میتری رۆژهەلاتی سەقز ولە رێگای سنە- سەقز تادەگەیتە دوورێگانەی تیکانتەپە.

ئەمجارلە سەر دوورێگا، کە بەرە وتیکانتەپە دەرۆیت تا نزیکەی دە کیلۆمیتر لە سەر جادە وبەدرێژایی پێنج کیلۆ میتر رووبە رۆژاوا دەگەرێیتەوە تادەگەیت بە کوێستانێکی جوان ورازاوە وسەرنج راکێش و ئیتر رێگای ماشین رە و تەواو دەبێ. ئەمجار غاری گەورەی کەرەفتوو دەگەل چەن ئەشکەوتی بچووکی دەوروبەری دەبینین.

ساختمانی ئەسلی ئەشکەوتی کەرەفتو و۳۵ میتر بەرزایی هەیە، کە دەرگای غارەکە پلەکانەکانی فەوتاوە و بەنەردیوانێکی درێژوپێکەوە بەستراو دەتوانین بۆی سەرکەوین ولە دەرگای ئەشکەوتەکەوە بچینە ناوەوە. ئەوسا دەگەینە هۆدەیەکی خۆش وگەورە ورازاوە کە دوو پەنجەرەی جوانی تێدایە و لە ناوەراستی دیوەکەدا تەندووریان هەلکەندووە ولە دیوارەکانیدا تاقیان لێداوە.

ئەشکەوتی کەرەفتوو سێ نهۆمە، کە ئێمە کاتێ دەچینە ناوی، دەگەینە نهۆمی ناوەراست ولەوێ دەتوانین بە ناوچەند دالاندا بچینە نهۆمی سەر ،یان خوار.

ساختمانی ئەشکەوتی کەرەفتوو هەمووی بەردی رەشە ئەم هەموو هۆدەو دالان وژێر زەوین وئۆتاقانە، هەمووی بە دەستی بە شەرهەلکەندراون. گەورەیی وجوانی ورێك وپێکی ئۆتاقەکان زۆرجێگای سەرنج و سەرسورمانە. کاتێ لە نهۆمی ناوەراست بە دالانێکی تاریکدا دەچینە سەر، دەگەینە تالارێکی گەورە کە زیاتر لە پێنج میتر بلیندە وزیاترلە دە میتر پانایی ئەو تالارەیە و دەتوانێ سەدان کەس لە خۆیدا جێ کاتەوە. لە بنی ئەم تالارەدا چەند وەتاقی تاریك هەن کە پڕن لە شەمشەمەکوێرە و زۆر دیمەنێکی خۆفناکی هەیە و خەلك بەو دیوانە دەلێن زیندان. هەرلەیەکێ لەم وەتاقانەوە ئەگەر بەلەدمان لە گەل بێ وئامرازوچرامان پێ بێ، دەگەینە نهۆمی خوارێ، کە چەند وەتاقی هەیە ودووحەوزی ئاوی شیرین وتالی لێ سازکراوە. لە دیواری ئێرەدا چەند خەت ودێڕی لە بەردهەلکەندرا و بە زبانی یۆنانی دەبینین کە دەلێن شوێنەواری سلووکیە - کانە.



قەلای کەرەفتوو- دیاری عەلی مەحمەدیان - تیکاب

لە نهۆمی سەرەوەی غارەکە وەتاقی فەرمانڕەوایانی گەورەی ئەوێ بە چەشنێکی زۆرجوان سازکراوە.

سەرمیچی ئەو وەتاقە بە چەشنێکی کەمانی و هیلالی تاشراوە و لە دیوارەکانی چەند نەقش ونیگارو گوڵ ، کە بە چەشنی ئەوانە لە تەختی جەمشید دا دەبیندرێن، هەڵکەندراوە ودووپەنجەرە و هەیوانێکی خۆشیان بۆساز کردووە. ئەم دیوە ئاشپەزخانە وتەنووری لە تەنیشتی خۆیەوە بۆ سازکراوە ودەرگاکەی بە کڵۆم* داخراوە، کە شوێنەواری کڵۆمەکە بە جوانی دیارە.

لە بەر وەتاقی فەرمانڕەوادا سەکۆی نیگەهبان وقەڕەوڵەکان وەبەر چاو دەکەوێ، کە هەر کام بە مەشعەڵێکەوە لەوێ کیشکیان داوە وئێستاش شوینی دوو-کەلی مەشعەلەکان لەجیگای خویاندا دیارن. بەرانبەری وەتاقی فەرمانڕەوا دیوێکی ترهەیە کە لە ناوەراستی ئەودیوەدا بەردێکی گەورە وەکوو نیوە ستوونێك دانراوە، کە سەرەکەی چاڵە ودیارە ڕۆن گەرچەکیان تێکردوە وبۆ ڕۆشنایی و سووتاندوویانە. هەر لەم دیوەدا بارستایێکی جوان لەبەر ڕۆچنێکدا سازکراوە، کە زۆر وێ دەچێ ئەمە جێگای نومایش وشانۆبووبێ.

لە چیای ڕووبە ڕووی وەتاقی فەرمانرەوادا سێ تاشەبەردی گەورە وتاشراو بە وێنەی پەیکەرەی ئەبولهۆلی میسردەکەوێتە بەرچاو. دیارە ئەمانە پەیکەرەی ئەوخودایانە بوو کە لە قەدیمدا پەرەستشیان کردوون. چوون بوتپەرەستی لە کوردستاندا نەبووە، عەقڵ بوێ دەچێ کە ئەمەیش شوێنەواری یۆنانیەکان بێ، کە بڕوا وباوەڕیان بەدەیان خودای وەکوو زێئۆس وژۆپیتێر و...بووە.

لە نهۆمی دووهەمی ئەم غارە بۆ دەرەوە ئاوێکی سارد وخۆش وشیرین وەکوو پلووسك* وناودان بۆ دەرەوە دەرژێتە خوار،کە ئەوانە دەچنە ئەوێ ولەوئاوە دخۆن. لە بەرانبەریاندا چەند مەیدانی پان و بەرین و ساف لەگەڵ گۆڕستانێکی دەورەی موسوڵمانان دەبینین.

سەبارەت بە مێژووی ئەم ئەشکەوتە، وەکووکاك رەشیدی کەیخو سرەوی نووسەری کتێبی بەنرخی "دەورانی بێخەبەری" نووسیویەتی زۆر لە قەلای زێوییە ودەورەی ئاشوور وماد کۆنترە. لە نووسراوەیەکی دۆزراوە لە زێوییەدا دەرکەوتوە کە دانیشتوانی زێوییە پاش شەڕولێدانێکی زۆرتوانیویانە ئەم قەلایە بگرن. بۆیە لەو دەمەوە پیان کوتووە "گرفتوو" واتە قەلای گیریاو= قەلای فەتح کراوە. ئێستاش ئەو ناوی گرفتو بووە بە کەرەفتو(1).

بە چەشنی کە خۆم لەگەڵ هەیئەتێکی مێژووناسی ئێرانیدا دیومە ولێمان کۆڵاوەتەوە شوێنەواری بەر لە مێژووی زایینی (میلادی) تادەورەی مەغوول لە سواڵەتە دۆزراوەکانی کەرەفتوودا بینراوە وبۆخۆم نموونەم لێ گرتووە وهەر ئەو گۆڕستانە ئیسلامیەی بەرانبەری دەیسەلمێنێ کە غاری کەرەفتو لە پێش تاریخەوە تاهاتنی مەغوولەکان ئاوەدان بووە و کەلکیان لێ وەرگرتووە.

تائێستا دەیان لێکۆڵەر*وزانای گەورەی ڕۆژاوا وڕۆژهەڵات لەم غارە دیتنیان کردوە ونەعاوی خۆیان لێ نووسیوە، وەکوو : راولینسۆن، کربۆتۆر ،ویلسۆن، ریچ، گریەنهاوس و.....

جێگای دەردو دڕێخە کە تا ئێستا هەنگاوێکی گرنگ وباش بۆتەمیزکردن وناساندنی هەرچی زیاتری ئەم شوێنەوارە جوان وبەنرخە مێژووینەی کوردستان هەڵنەگیراوە.

تەنیا بەوەی کە ناوی لە لیستی شوێنەواری نەتەوایەتی میلەتی ئێران لە ئیدارەی باستانشوناسی دا نووسراوە، بەسیان کردوە. لە حاڵێکدا ئەگەر لە سەری کار بکرێت، هەم زۆرکەس لە توێژکارانی دەرەوە ونێوخۆ بۆدیتنی دێن وهەمیش دەبێتە جێگایەکی سەرنج ڕاکێش بۆئەویندارانی فەرهەنگ ومێژووی شارستانیەتی گەلی کورد.

## بەدڵی شیعر

# دڵێ

دڵێ تەڕ نەبێ، دڵێ تەڕ نەبێ
دڵێ لە خۆیا دائیم تەڕ نەبێ
سەرخۆشی بادەی رووی دولبەر نەبێ
بەجامی شەراب کەیل ومەستی کەی
خوایە ئەودڵە دائیم پەستی کەی

* * *

دڵێ هێلانەی عەشقی یار نەبێ
بەتیری نازی بریندار نەبێ
کوشتەی دوودیدەی پڕخومار نەبێ
بە جامی شەراب، نەشئەی پێ بدەی
خوایە ئەودڵە دائیم پەستی کەی

* * *

دڵێ کە کانگای مەعریفەت نەبێ
سەرچاوەی عەشق ومەحەببەت نەبێ
رەهبەری رێگەی حەقیقەت نەبێ
بە جامی شەراب، جیلوەی دەربخەی
خوایە ئەودڵە دائیم پەستی کەی

* * *

دڵێ دووچاری خەفەت نەبووبێ
بە شمشێری عەشق لەت لەت نەبووبێ
پەروەردەی دەردومێحنەت نەبووبێ
ئاواتی نەبێ، غەیرەز مەی ونەی
خوایە ئەودڵە دائیم پەستی کەی .

* * *

«فایق بێکەس»



# یاران کێ دیەن

یاران کێ دیەن، یاران کێ دیەن
سەر روشتەی خەمان چون من کێ دیەن

قەلبم جەبۆتەی زەرەی خەم بیەن
رۆحم بە خەمناک، ئی قاڵب شیەن

ئەسڵم جەخەمەن، جە خەم بیەنا
با بۆ من خەما، خەمانی دیا

سەر تا پام خەمەن، جەمەدر سەی خەم
دەرسی خەم وانام، جەلام بیەن جەم

دەرسم هەر خەمەن، هەر خەم مەوانو و
غەیر جەخەم فیشتەر، هیچ نەمەزانوو

هەر کەس خەمگینە، بەیۆ وەلای من
خەم چەنی خەمان، زوو مە بۆ ساکن

«سەیدی هەورامی»

# پەند

زۆرشت هەن
زەنگ هەڵدێنن و
پیر ئەچنەوە
دواییش ئەمرن
وەکوو تاج وسەوڵەجان و
تەختی ژێر پێی پادشاکان،
زۆرشتی تری دنیاش هەن
نارزێن و، بەرناچنەوە و
هەرگیز نامرن
وەکوو، شەپقە و
گۆچانەکەو
پێڵاوەکەی
"چارلی چاپلین"

-«شێرکۆ بێکەس»-



خۆزگە وەك خۆر، نەمدیبایە شەوی تار
خۆزگە تاویّ رام نەبواردبایە بیّ یار

خۆزگە پیری کە لە لای نە دەکردم
خۆزگە لە یەکەم ژوانگەدا، دە مردم

## خۆزگە «هێمن»

# «ئەوساتەی»

ئەوساتەی ،دارستانی تاوی باران لێداوی خۆزگەم،
باوەش بۆ هەتاو ئەگرێتەوە و،
هەتا وئاسکی سرك ئاسایی هەلدیّ
گریانت لەناو زیندانی پێکەنینا،
بۆدیل ئەکەم!
ئەوساتەی ،هەورازی شەوئەبڕم،
لەناودلنیایی وگوماندا ،رائەمێنم
ئەلێم ئاخۆ
بەیان لەئاسۆدا سەمائەکا ؟!
یان لەکۆمی برینێکا مەلە ئەکا ؟!
ئەوساتەش هەرمەشقە لانی
ئاگری لێوم ...
خەوبە شنەی سەرلێو تەوە ئەبینیّ
چۆن هۆگری گولالەی قەدکەژی" زەردە"و
شەقەی بالی کۆترەکەژیی ئێوارانی لای خۆمانم
هۆگری تۆم
تۆش رووبارئاسایی
بەرە وبەندەری تەم ومژەەنگاو ئەنێی ...
بیستوومە هەوری رەش
ئەکەی بە لەچکی گەردن وسەرت
پالتۆی شەو، ئەکەیتە بەرت
مەکری! مەکری!
- وەرە ولەسەرگولی زامی من بخوێنە
لەشەوگاری شەقامی ماتی ناودلما
گۆرانی بۆسبەینی بلێ
کەزیی زەردی شێعرەکانم دابهێنە!



-- ئەنوەر قادر محەمەد --

# پاییز

گەلاریزانە، فەسلی خەزانە
کەوای خەزالان ،کەولی خەزانە

قازو قورینگان لە دەم شەتاوان
بە شین وڕۆ ڕۆڕۆیین لە تاوان

سەر سەوز وبورچین لەدەردوداخان
خزین خزانە بن بەردوشاخان

نەمالەباغان نەگول، نە بولبول
چریوە نایە چ ماکولی دل

نایە ونابیسم لە مەل جریوە
لەشیوە ودولان قاڕە وقرپیوە

نەگمەی کۆتر، نەقاسپەی کەودیّ
نەلەم سریوە، نە دەنگی ئەودیّ

کوانی گولالەی دیوونە دیوان
سوێسنەو هەلالەی بەرقەدوسیوان

کوا هاڕە هاڕی ئاوی هەلدێری
کوابلوێری شوان ،کواشەنگە بێری

گولی یاقووتی وگەلای پیرۆزە
لە کوێن لێك بکەن جێژنە پیرۆزە

گەلاوەریون زەردونارنجی
بۆ وازوو رۆیی زەمانی گەنجی

"بۆکان،پاییزی ٦٥

-- مامۆستا حەقیقی --



# رازی بەختەوەری

مریەم رەسوولپوور ـ چیمەن ،

رۆژانە لەولاٚتی ئێمەداسەدان کچ وکوڕی لاو زەماوەند دەکەن و بۆیەکەمین جار وشەی ( مێردی من ، خێزانی من) یان بە سەرزماندا دێ و دوای رێ و رەسمی دەستگیرانی و زەماوەند، ژن ومێرد هەردووبەیەك بیرو ئامانجەوە و بەزەوق وشەوقەوە بەرەوژیان هەنگاو دەنێن ۰

بەلاٚم هەندێك جار وارووددەداکە ژن ومێرد بەرەو ئەوجێیەی کەرۆژێك لەرۆژان بۆنی ئەوینێکی نەمری لێ هاتووە ، دەچن وبەدەستی لەرزۆك کاغەزی تەلاٚق و جوێ بوونەوە ئیمزادەکەن ۰ یائەگەر نەشگاتە ئەم پلەیە گەلێك ، پاش ماوەیەکی کورت پەشیمان و نائومێد،ئاوات بۆ رۆژانی پێش زەماوەند دەخوازن و بەمەشەوە راناوەستن و ئامۆژگاری لاوانی دیکە دەکەن کە هیچ کات ژن نەهێنن یاشوو نەکەن ۰ ئیتر تامردن لەژیانێکی ساردو سڕوبێ تام وبۆدا بەسەر دەبەن ۰

تۆبلێی لەم ماوەیەدا لەنێوان ئەم گوڵە سوورو گەشانەی ژن و مێرد ایە تیدا چێ روویدا کەوەرزی پاییزیان بەسەردادێ و هەست و نەستیان بە جارێك دەگۆڕێ ،هیوا و ئارەزوویان لەدەست دەدەن وئەوینی هەمیشەیی لەنێوانیاندا لەبەین دەچێ و تەنانەت ئەسەرێکیشی لێ بەجێ نامێنێ ؟

بەپێی بۆچوونی کۆمەڵناسان ، هۆی سەرەکی جودایی یا شێواندنی ژیانی ئارام و پڕ لەخۆشبەختیخاو خێزان بریتی یەلە: رەفتاری خۆپەسەندانەی ژن یا مێرد یاهەر دووکیان ، رێك نەکەوتن لەرووی ئەخلاقی وبیرو روانینە وسۆزیان ، بێ وەفایی ، دڵپیسی ،نەزۆکیو۰۰۰

رەنگە ئەم پرسیارە بە بیری خوێنەرانی بەرێز دابێ کە ئایا ئامۆژگاری و رێنوێنی دەتوانێ لەپێك هێنانی خێزانی رێك وپێك و خۆشبەختدا دەوربگێڕێ ؟ لەوەلاٚمدا دەڵێین ژیانی خێزانی پڕەلەگیرو گرفت وکەندوکۆسپی گەورەوبچووك کەلە توانای هیچ کەسدانیە و وەك فۆرمۆڵێکی ئامادە چارەسەری یەك بەکی ئەم گیرو گرفتانە بدابەدەستەوە ۰ بەلاٚم ئەوەی لە توانادایە ئەوەیە کەچوارچێوەیەکی لەبار بۆ چارەسەری ئەم گیروگرفتانەپێك بهێنرێ ۰ ئیتر چۆنیەتی سوود وەرگرتن لەم رێنوێنی و ئامۆژگاری- یانە دەکەوێتەوە سەر ئەوەی ئێمە خۆمان چەندە ئامادەییمان بۆ سوود وەرگرتن لێیان هەیە و تا چ ئەندازەیەك بەدڵ دەمانەوێ سوودیان لێ وەربگرین ۰

پەیوەندی ژن و مێردایەتی چەند جۆرە کە بریتین لە : یەكژنی چەند ژنی ، چەند مێردی ۰

یەك ژنی : یانی ژیانی هاوبەش و بەڕێوەبردنی کاروباری ماڵ بەهۆی یەك ژن ویەك مێردەوە ۰ ئێستا لە زۆربەی ولاٚتانی دنیادا ئەم جۆرە پەیوەندی یە لەگۆڕێ دایە و وەك یاسایەك چەسپاوە۰

چەند ژنی : بریتی یە لە پەیوەندی وژیانی هاوبەشی پیاوێك لەگەڵ چەندژندا ۰ ئەم جۆرە پەیوە - ندی یە لەو ولاٚتەکانی ئاسیاوبەشێك لەو ولاٚتەکانی ئەفەریقادا لە گۆڕێ دایە ۰ هۆی سەرەکی پەد... چەند ژنی جیاوازی نێوان ژمارەی ژنان و پیاوانە ۰ واتاکاتێك ژمارەی ژنان لەژمارەی پیاوان کەلە ئەنجامی جەنگ یاهۆی دیکە لە ناوچووبن ، زیاتربێ ۰

بەلاٚم پەیوەندی چەند مێردی بریتی یە لەپەیوەندی نێوان چەند پیاو لەگەڵ یەك ژندا ۰ ئەمەش لەنێو ئەو قەبیلە وەحشیانەدا باوەکەژن لەنێویاندا یەکجارکەمە۰

لەولاٚتی ئێمەدا هەرچەندەیەپێی یاسای پیرۆزی ئیسلام پەیوەندی چەند ژنی ئازادە کەبۆ ئەمەش مەرج و بەڵگەی بەجێ دەخاتەروو۰ بەلاٚم هەر لە هەمان کاتدا ح یاسای پیرۆزی ئیسلام وح تایبەتمەندی یەکانی ئەخلاقی سەردەمی نوێ زیاتر هانی

پەیوەندی یەك ژنی دەدەن و لە لایەن زۆربەی زۆری خەڵكی و ڕێبەران و لێپرسراوانی دەوڵەتیشەوە ئەمەیان پەسەندترە و ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر دەچەسپێ ·

بۆ ئەمەش كەمێك هێنانی خێزان و بەستنی پەیوەندی ژن و مێردایەتی شێوەیەكی یاسایی و شەرعی بەخۆوە بگرێ پێویستی بە بەستنی عەقد هەیە · كەواتە عەقد بەستن فەرمانێكی یاسایی وشەرعی-یە كەبۆ پێك هێنانی خێزان ئەنجام دەدرێ · جاهەر لەوساتەوە كەعەقد دەبەسترێ كۆمەڵەپەیوەندی یەكی گیانی ومالی دێتە گۆرێ وژیانی ژن ومێرد بەونیازەی بۆ هەمیشە درێژەی هەبێ و بەدرێژایی ژیان ، هەردوولا لە خێزانێكی ئارام و خۆشبەختدا بەسەر بەرن ،پێكەوە گرێ دەدرێ · بەڵام سەركەوتنی ئەم نیازەش بەستراوە بەوەوە كەئایا ئەم پەیوەندی یە بەڕاستی لەسەر چ بناغەیەك · لەسەر بناغەی پووڵ و دارایی ، یاجوانی ولەزەت پەرستی، یاڕێز وخۆشەویستی یاشتێكی تر دارێژراوە ؟

خۆشەویستی چیە ؟

كۆمەڵناسان بەم جۆرە باسی خۆشەویستی دەكەن :

" خۆشەویستی هەستێكی فیداكارانە و پەیوەندی یەكی بە هێزی گیانی و دەروونیە · "

ئستاندال بەم جۆرە باسی لێوە دەكا : " خۆشەویستی كێ بەركێی نێوان ژن ومێردە تاهەركامیان ئەوەندی لەتوانادابێ خۆشبەختی بۆئەوی دیكەی بێنێتە كایەوە · "

خۆشەویستی ، یانی پەیوەندی دەروونی نێوان ژن ومێردو نێوەرۆكی نەمری ئەدەب وهونەر · خۆشەویستی هەمیشە جێگای سەرنجی كۆمەڵنا - سان و مامۆستایان و پزیشكان بووە و هەیە · چونكە خۆشەویستی بە سۆراخی هەمووكەس دەچێ و بە درێژایی ژیان پلەیەكی تایبەتی داگیردەكاو بەهیچ شێوەیەك ناتوانرێ بەبێ ڕێز وخۆشەویستی خێزانێكی قایم ورێك وپێك و خۆشبەخت پێك بهێنرێ وكەسانێك كەبەگیان و دڵێكی خاوێنەوە بەرەورووی خۆشەویستی ناڕۆن وهەوڵ دەدەن ئەم هەستە مەزنە بەش بەش بكەن هەرگیز ناتوانن ئاوازی ڕاستەقینەی عێشق بڵێن ،ئاوازێك كە جوانی و خۆشبەختی ونێوەرۆكی تازە بەژیان دەبەخشێ ·

ئینسان بۆ ژیانی پڕلەشادمانی پێویستی بەخۆشەویستی یە ·چونكە خۆشەویستی رەمزی خۆشبەختی یە و زامنی بەردەوامی وپەرەسەندنیەتی ·

زانای گەورە(ئا - فوریل)دەڵێ :

" ئەگەر خۆشەویستی هاورێ لەگەڵ ڕێز و لەیەكتر گەیشتن بێ ڕۆژبە ڕۆژ بەهێزتر دەبێ و شادمانیجەژنی بیست وپێنجەمین ساڵی زەماوەندی ژن ومێرد، بێ ئەندازە لەیەكەمین ڕۆژی زەماوەندیان زیاتردەبێ · "

پێویستە لاوان یاژنان ومێردانی بێ تەجرەبە ئەم ڕاستی یە بزانن كە هەركاتێك پەیوەندی ژن و مێرد لەسەر هەر بناغەیەكی دیكەی جگەلە ڕێز وخۆشەویستی دارێژرابێ ،سەر ئەنجامەكەی هەرساردوسڕی وتێك شكان ولەناوچوون دەبێ ·

جارێك كۆمپانیایەكی ئینگلیسی كێ بەركێ یەكی دەربارەی هەڵبژاردنی لەبارترین كچ و كوڕ بۆئەوەی ببنە ژن ومێردی یەكتر ساز كردبوو ·

لەم كێ بەركێ یە دا ( ١٢/٠٠٠ ) كچ وكوڕ بەشداریان كردبوو· بەشداربووان پرسیار نامەیەكیان پڕكردبۆوە كە لەوێدا دەربارەی تەمەن ، ڕەنگی موو ، چاو ، ئارەزووی جۆراوجۆر ، بیر و باوەڕ دەربارەی ژیانی هاوبەش، و چەندان شتی تر پرسیار كرابوو · پاشان تەواوی ئەم پرسیارنامانەیان دایە كامپیۆتەركچێكی ١٩ ساڵەی بەنێوی ( ئانا ) كەمونشی بوو بۆ كوڕێكی ( ٢٢ ) ساڵە بە نێوی ( درەك ) كەدوكانداربووهەڵبژارد · ئەوان دەبوایە جووتێكی لەبار بوونایە بۆیەكتر ·

ئەم دوولاوە لەگەڵ یەكتر ئاشنابوون و بۆئیسراحەت وگەڕان چوونە پاریس كەتەواوی خەرج و مەسرەفیان لە ئەستۆی هەمان كۆمپانیابوو · لەوێ لەنزیكەوەلەگەڵ یەكتر ئاشنابوون · كاتێك گەڕانەوە لەندەن زۆر سادەو ئاشكرالێك جوێ بوونەوە · كچەكە دەیگوت : " درەك بەگشتی كوڕێكی چاك و سەرنج ڕاكێشە بەڵام بەدەردی من ناخوا · " كوڕەكەش دەیگوت : " ئاناچاك و مێهرەبانە بەڵام هەست بەخۆشە - ویستی ئەوناكەم · "

بەم جۆرە ئایا كامپیۆتەرەكە بەهەڵەداچووبوو؟ نەخێر ، لەڕووی تیۆری یەوە درو ست وحسابی هاتبوونەوە · بەڵام ئەوەی لەم ناوەدا كەم بوو خۆشەویستی بوو ·

ئەمرۆ لەو لاتەرۆژ ئاوايیەکاندا پەیوەندی نێوان ژن وپیاوبە شێوەیەکی ریاکارانە و دوور لە عیفەت و داوێن پاکی رەواجی پەیدا کردووە و لەژێر پەردەی ئازادیدا بێ شەرمانەستایشی رق و کینە و حەسوودی و پەیوەندی ناپاك و ناشەریفانە دەکەن کە هیچ رێز و خۆشەویستی یەکی تێدا بەدی ناکرێ و ئینسان تاپلەی ئاژەڵ دەهێننە خوارێ ·

عیفەت وداوێن پاکی وپێویستی دوور کەوتنەوە لەپەیوەندی ناپاك و ناشەریفانە بیروڕای کۆنەپەرستانە و قەدیمی نین · ئەمانەجگەلەوەی چەندشتی ئەخلاقین پلەوپایەی خۆشبەختی و سەلامەتیشن ·

بۆپێك هێنانی خێزانێکی سەرکەوتووی شادمان رەوشتی بەرز ، عەقڵی کامل ، مەرجی رەوانی تایبەت و تایبەتمەندی یەکانی ئینسان وبەشێوەیەکی گشتی زانیاری تەواو پێویستە ·

گەلێك لەژنان خۆشبەختی خۆیان تەنیا لەزێڕی زۆروجل وبەرگی بە زەرق و بەرق دا دەبینن ·

ئەمەش تەنیا بۆ ئەوەی لەپێش چاوی خەلکی خۆیانی پێ بنوێنن ·بەلام ئەمانە تووشی گەورەترین هەڵەدەبن چونکەلەسەرێکەوە لەبەر ئەوەی خۆیان حەسوودوچاوتێرنەبوو پەروەردەدەکەن هیچ کاتێك ناگەنە ئەو خۆشبەختی یەی خەونی پێوە دەبینن · لەسەرێکی دیکەشەوە عێشقی مێردو منالەکانیان کەم کەم دەکەنە قوربانی ئارەزووە پووچەکانی خۆیان ·

هەرواگەلێکیش لەپیاوان ئلێت وخولیای جوانی و رێك و پێکی روخساروقەدوبالان وتەواوی خۆشبەختی خۆیان لەم لایەنەوە دەبینن · دیارە ئەمانەش بەهەڵە دا دەچن چونکە تاقی کردنەوە سەلماندوویەتی کەئەم جۆرە پیاوانە لەگەڵ جوانترین ئافرەتدا تا ماوەیەکی کورت بەسەردەبەن و پاشان پێیان وایە ئەوەی بە دوای دا دەگەڕێن هێشتا نەیگەیشتوونێ · جگەلەمەش ئەم راستیەیان لەبیر دەچێتەوە کە جوانی روخسارو قەدوبالا شتێکی کاتی یە وهیچ کاتێکیش ناتوانێ تاریکی رەوشت و رەفتاربشارێتەوە · بەلام تەندروستی گیان وروح و سەلامەتی رەوشت و رەفتار هەمیشە تاریکی دەم وچاو لەبن خۆیدا دەشارێتەوە ولەناودەبا ·

بەلام ئەم جۆرە ژن و پیاوانە مانای خۆشەویستی واقیعی کە بریتی یە لەوەفاداری وفیداکاری و بریتی یە لە پێشکەش کردنی بەشێك لەهەستی خۆت بەتەنیادۆستی چاکت ، نازانن ·

ئەگەر خۆشەویستی واقیعی لەگۆڕیدابێ تەواوی گیروگرفتەکانی رێگای ژیان چەندە گەورەبن بچووك دەنوێنن و لەبەرتیشکی گەرمی خۆشەویستی دەتوێنەوەو نامێنن · بەگشتی ژیانی پڕلە چەرمەسەری و هەژاری ئەگەر خۆشەویستی تێدابێ چەندان جار لەو ژیانە شادوخۆشترە کەبەروالەت رازابێتەوە و تەنیا لەرووی مادییەوە تێر و تەسەل بێ · لە کۆنەوە گەلێك نموونەمان لەبەر دەستدایە کەئەم راستی یە دەسەلمێنن ·

مێژووبۆمان دەگێڕێتەوەکە جارێك پادشایەك سناتۆرێکی یاخی خۆی بەنێوی " پۆلی سابینی " زیندانی دەکات · ژنی سابینی بەنێوی " ئەپۆنیبا " بۆماوەی ( ٩ ) ساڵ لەسەر ویستی خۆی دەچێتە زیندان و لەگەڵ مێردەخۆشەویستەکەیدا ژیان بەسەردەبا · پاش بەسەر چوونی ئەم ماوەیە سابینی حوکمی مەرگی بەسەردا دەدرێ · ئەپۆنیبا ی چاونەترس و مەغروریش هەستی خۆی ناگۆڕێ وقبووڵ دەکا لەگەڵ مێردەکەیدا بمرێ · و پێش مردنی روولە پادشا دەکا ودەڵێ :

" لەم ماوەیەدا کەمن لەگەڵ مێردەکەم لەزینداندا ژیام وەها خۆشبەخت بووم کەتۆئەی پادشا لە کاتێکدا لەژێر ئەم خۆرەدا بەتەواوی شکۆوهێزو توانای پادشایەتیتەوە ژیاوی ،هەرگیز وەکوو ئێمەخۆشبەخت نەبووی ! "

بەلێ ، خۆشەویستی هەستێکی بەنرخ و پەیوەندی و باوڕپێ کردنی بەرابەرو ئامادەیی ژن ومێردە بۆ بەشداری غەم وشادی یەکتر و دەست لەناو دەستی یەکترنانە بۆ بڕینی رێگای پڕلە کەندولەندی ژیان ·

ئەوینی راستەقینە، لە خۆپەرستی و رەفتاری ریاکارانە و فێڵ وکەلەك دوورە · بەلام هێندێك هەر لەهەنگاوی یەکەمەوە بەدڵێکی پاك ناکەونە رێ و بە بچووکترین بەهانە ژیانی ئارام وگەرم وگوڕی خۆیان دەشێوێنن ·

یەکێك لەگیروگرفتەکانی گەورەی نێوان ژن ومێرد، باوەڕ بە

یەکترنەکردن ودڵپیسی یە. کە کەم خێزان هەن کەم و زۆر بەتایبەتی لەسەرەتای دروست بوونیدا ئەم گیروگرفتەی تێدانەبێ .

دڵپیسی یەکێکە لە نەخۆشی یە پڕمەترسی یەکانی کەرەنە خێزانی پێ هەڵوەشێ وتێك وپێك بدرێ . ئینسانی دڵپیس خۆشەویستی لە دڵدانیە یائەگەر هەشبێ ڕەنگی هەڵێناوە. چونکە تەنیا لەئەنجامی بێ باوەڕی ونەبوونی خۆشەویستی - یەوەیە کەژن ومێرد یەکتر بە خیانەت تاوانبار دەکەن. ئەگەر ژن و مێرد خیانەت بەیەکتر بکەن دیارە ئەوانە هەر لەبناغەدا یەکتریان خۆش ناوێ . ئیتر دڵپیسی چارەسەری گیروگرفتەکانیان ناکات. چونکە لەم جۆرە حاڵەتانەدادڵپیسی بکەن یانەکەن زوو یا درەنگ ئەم خێزانە یالێك هەڵدەوەشێ یا بە ناچاری ژیانێکی بێ ڕەنگ وبۆ بەسەر دەبەن .

ژنان و مێردانی تازە لاو لە جیاتی دڵپیسی و پەروەردەکردنی شك و گومانی بێ بەڵگە لە دڵی خۆیاندا چاکتروایە بەوپەڕی دڵنیایی یەوەباوەڕ وڕێز وخۆشەویستی بێ غەل وغەش لە دڵی خۆیاندا پەروەردەبکەن . چونکە بەم جۆرە دەتوانن تەنانەت یەکتری لەوگوناهو هەڵانەش بپارێزن کەرەنگە بەرێکەوت لەڕێگای ژیانیاندا یەخەیان پێ بگرن .

یەکێکی دیکە لەگیروگرفتەکانی هێندێك خاوخێزان نەبوونی منداڵە.

هێندێك پیاو،نەزۆکی ژنەکانیان دەکەنە بەهانە بۆ جوێ بوونەوە یا بۆسەرزەنش وگوناحبارکردنیان و گەلێك لەتراژێدیەکانی وەك :

تەلاق . ژن بەسەرهێنان.چارەنووسی خراپ .... لە ئەنجامی نەبوونی منداڵەوە ڕوودەدا .

جاران هەمیشە گوناهی نەبوونی منداڵیان دەخستە ئەستۆی ژنان . تەنانەت ئێستاش لەم جۆرە بیر و باوەڕانە هەن . بەڵام زانستی پزیشکی ئەم ڕاستی یەی دیتۆتەوە کە گوناهی نەزۆکی تەنیا بۆ ژنان ناگەڕێتەوە و گەلێك جار هۆیەکەی دەکەوێتە ئەستۆی پیاوان .

جائەگەر ژن ومێرد منداڵیان نەبوو. چاکتروایە ڕێزوخۆشەویستی یەکتر ڕابگرن و شایستەنیە یەکتری سەرزەنش بکەن و یاژیانی خۆیان بەکێشمەکێشی بێ پایان بکەن بە دۆزەخ . چونکە ئەوانەی نەزۆکن گوناهی خۆیان نیە. بەڵکوو لەزگماکەوە یابەمنداڵی تووشی جۆرە نەخۆشی یەك بوون کەبۆتە هۆی نەزۆکی یان.

دیارە بێ منداڵیش ئەگەر لەڕێگای پزیشکی یەوە چارەسەر نەکرا ڕێگای چارەی دیکەی هەیە . بۆنموونە دەتوانرێ منداڵێکی بێ دایك و باب بەخێو بکرێ وپەروەردە بکرێ . دەیان و سەدان نموونەی واهەن کەژن ومێرد منداڵێکی دیکەیان بۆ پەروەردەکردن هەڵبژاردووە وپاشان وەها لەلایان خۆشەویست بووە کەوەك منداڵی خۆیان خۆشبەختی وکامەرانی پێ بەخشیون .

بەگشتی هۆی زۆرهەن کەدەبنە هۆی لێك هەڵوەشان و تێك چوونی ژیانی خاووخێزان کەهەم ژن وهەم مێرد تێیدا گوناهکارن .

ئێستا تۆئەی خانمی خۆشەویست ئەگەر لەژیانی خێزانی بێزاری وئەگەر دەتەوێ ژیانی خۆت ومالّ ومنداڵت تێك و پێك دەی بە پێی ئەم خاڵانەی خوارەوە ڕەفتار بکە:

● ۱ - دەست بڵاوبەوهەمیشە داوای پووڵ لە مێردەکەت بکە .

● ۲ - هەمیشە بێزارونارازی بەو سکاڵا لەدەست ژیان بکە !

● ۳ - مێردەکەت لەگەڵ پیاوانی دیکەبەراوردبکە وبەوانی بشکێنە!

● ۴ - ڕێز لە مێردەکەت مەگرە و هەرچی ئارەزووی ئەوە تۆبە پێچەوانەوە ئەنجام بدە !

● ۵ - ڕێز لە کەس وکاری مێردەکەت مەگرە وتا دەتوانی بێ ئیحترامیان پێ بکە !

● ۶ -هەمیشە عەبووس و دەم وچاو ترشاوبە !

● ۷ - دەم هەراش وجنێوفرۆش بە !

● ۸ - لەپێش چاوی مێردەکەت پیس وپۆخڵ بە وگوێ بە ڕێك و پێکی خۆت وناومالّت مەدە !

وەتۆش کاکی بەڕێز ئەگەر دەتەوێ دڵی خێزانت لە خۆت بڕەنجێنی ولە خۆتی بێزار کەی و ژیان لەخۆت بکەی بە زەهری مار ئەم خاڵانەی خوارەوە جێ بەجێ بکە :

● ۱ - لەگەڵ خێزانت کەمدوێ بە و هەرچی لەماڵێدا دەگوزەرێ گوێی پێ مەدە !

بڕوانە لاپەڕەی ۶۲

# بووژانــــەوە

دورگـــەی نــوستـــوو
ســمری نـابـوه ، كـۆشــی دەریــا و ،
جـەنگـــەڵ ، تــاریــك و نــووتــەك بـــوو
پــۆلــێ منــداڵ ،
خــاڵــی داخــی زیخیــان لــه ســەر
سنــگ و دڵ و تــه وێــڵ ، ئـەژمارد
بێشكــەی خۆزگـــەو
بیـــرەوەری یــه كۆنــەكانیـــان ، رائـــەهەژانــد

هەڵمی ئاخی ناخــی دەریـــا
چاوی ئاسمانی شڵە ژاندو
هــەوره تریشقـــــه ،
خـــەونــی قــووڵــی ئــاوی شڵــەقانـــد
شـەپۆلێكــی یاخـــی هـــات و
دورگـــەی لـــه خـــەو ، راچڵــەكانـــد
بێشكـــەی خـــۆزگـــه و بیـــرەوەری ، لێــك تـرازاو
پــۆلــێ پیــاوی ، مـــەزن ، مـــەزن ،
ئاسمــانیــان دەستــەمـۆ ئــەكـــرد
بــروسكـــەیـــان
وەكـــــووەەشخــــەڵ ...
بەرە ونــاخـــی جــەنگـــەڵ ئـــەبـــرد

* * *

# زامی ناسۆر

« جەلال مەلەكشا »



جـەستـەیـەكــی ، بریـنـدارم
زامـەكانـــم
قــووڵ و بـەتــرەف و نــاســۆرن !
وەك خــەمێكـــی مێــژینــەم و
لــه نــاو كلێپـەی ئـاگـردانـــی ئـەوینێكــا ، هەڵقرچـاوم
وەك ، ئاخێكـــی ، دووكــەڵاویـــم ،
هەڵمـــی ناخێكــی ، خنــكاوم
مـن ڕێبـواری مێــژووی تاڵــی دڵــی خـۆمــم
هــەر ئەڕۆم و هــەر ئــەڕۆم و هــەر جــێ مــاوم !
هـــاوار ئـــەكـــەم ،
ئەم ڕێـگایـــه ، نــابــڕێتـــەوە !
تــا پــێ بــه شــوێن یـەكـا نـەچــن ،
دڵ و گوڵــی لـــه یــەك بــڕاو
دەســـت لـــه ملــی یەكتــر نـەكــەن
دەستــی ڕاسـت و دەستـی چـەپـم ،
بــه یــەك نــەگــەن
تــا لــه ژوانــی ئــەوینێكـــا
پـەیمـان تـــازه ، نەكرێتـەوە ...
ئـەم ڕێگایـه نابڕێتــــــەوە ...
نـــابــڕێتـــەوە...

ڕێـبـوارێكـــم ،
بــه قـــەد مێـــژوو
وەرز و ســـاڵ و ســـەدەم ، دیـــوە
بــه قــەد مێــژوو ،
چقڵـــی ڕێــگام
لــه نێو سنـگ و دڵ چــەقیـــوە
بــه قـــەد مێـــژوو
دیێــوەزمـــەی بــه ســامــی ڕێـگا
لـــه ئاسمـــانـــی ، چـــاوەكانـــا
ئەستێـرەی گــەشی ، چنیـــوە
بــه قـــەد مێـــژوو
فرمێسكــی چـــاوم ســڕیـــوە
ڕێبـــوارێكــی چـــەواشـــەم و
خـــۆم نـــازانـــم ، بــۆ كـــوێ ئەڕۆم
تاریكـــه شـــەوێ نـــووتـــەكـــەو ،
ئەستێـــرەیـــەك پـــێ نــاكــەنــێ
هەڵاقێكــم بــەرەولایــەك ، هــەنگـــاو ، ئـەنــێ !
دەستــی ڕاســـت و دەستـــی چـەپـم
به قـەد ، مـــەودای ، سنـــوورەكان لـــه یــەك دوورن !

# ژن دەبەیتی کوردی دا

## قازی ـ ئەحمەد

باسی " ئافرەت " لە ئەدەب و وێژەی کەلاندا بابەتێکی سەرنج راکێشە و روون کردنەوەی بەسەرهاتی پرئێش و ئازاری پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی دوورودرێژ هەیە ئەگەر بمانەوێ بە دەوری ئەم مەسەلەدا قەڵەم هەڵسوورێنین و لە هێندێ راز و نهێنی پەردە هەڵگرین پێشەکی دەبێ دەست بکەین بە لێکۆڵینەوەیەکی کۆمەڵناسی مێژوویی و ئاڵ و گۆڕی ژیانی ئادەمیزاد لە سەرەتاوە تا ئەمڕۆ بخەینە ژێر باس و شی کردنەوە · پاشان کەسێك کە دەیەوێ ئاڵ و گۆڕی ژیانی ژن روون کاتەوە دەبێ لە زانستی رەوان ناسی ( پسیکۆلۆژی ) ، کۆمەڵناسی ( سۆسیۆلۆژی ) ئاینی و وێژە و مێژوودا زۆر شارەزا بێ · ئەوەی لە چوار چێوەی وتارێك لە گۆوارێك دا دەگونجێ تەنیا ئەوەندەیە کە نووسەر بە کورتی و بە پەلە چاوێك بە هەموو رووداوەکانی ژیانی ئافرەت لە مێژوودا بخشێنێ · بە هەڕەمە نیگای خۆی لە دەورانێك را بۆ دەورانێکی دیکە بگوێزێتەوە و قۆناغەکانی مێژوو بە هەڕەمە بە جێ بێڵێ و ئەوەی لە پێوەندی دەگەڵ ئافرەتدا بەزەینی دەگا بیخاتە سەر کاغەز و زوو خۆی بگەیەنێتەوە سەردەمی ئەمڕۆ ·

لەو سەرنجدانە بە تاڵووکەیەدا دەبینین کە زەمانێك ئافرەت لە سەرەتای مێژوودا گەرناس* و کار بە دەستی کۆمەڵگای خۆیەتی و بەرەی پیاو یا نێرینە لە ژێر دەسەڵاتی ئەو دایە · بە پێی هێندێ بەڵگەی کۆنی مێژوویی ژن بوو کە لە سەرەتاوە ژیانی شارستانەتی دەست پێکردو و یەکەمین دێ یا ئاوەدانی بە دەستی ئافرەت لە سەر زەوی بنیات نرا· زانایان لایان وایە ئینسان دەپێشدا وەك گیانداری دیکە پۆل پۆل و رەوە رەوە پێکەوە ژیاون و بە دوای خواردەمەنیدا ئێرو ئەوێ خولاونەوە و بۆ تێر کردنی خۆیان هەداداانیان لێ براوە و لە هیچ کۆشەیەك بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ نیشتەجێ نەبوون · ئاڵ و گۆڕی سەرما و گەرما و رووداوی سروشتی وەك بوولەرزە و ئاگر پژان و تۆفان لێرەوە هەڵیدا*شتوونە شوێنێکی دیکە ·

ژن بە پێی زگ کردن و حامیلە بوون لە



کاتێکدا قورس و گران بووە و نەیتوانیوە زۆر بجووڵێتەوە و بێروبەوێدا پێ بە پێی نێرینە هەڵێ و هات و چۆ بکا بە ناچار تا لە دایك بوونی منداڵ لە جێگایەك ماوەتەوە و بۆ ئەوەی خۆی لە سەرما و گەرما و هێرشی دڕندە و جانەوەران بپارێزێ پەنای بردۆتە ئەشکۆن و ئەشکەوتان و جاروبار بە دەستکردیش چەند بەردی لە سەر یەك داناوە و پەناگەیەکی بۆ خۆی و منداڵەکەی ساز داوە • هەر وەك دەزانین بێچووی ئادەمیزاد بە پێچەوانەی گیان لەبەری دیکە ناتوانێ زوو بە دوای دایك و باب دا پێ بگرێ و بکەوێتە ڕێگا • ئەوە بۆتە هۆی درێژخایەنی مانەوەی ژن لە شوێنێك • ژن لەو مانەوەیەدا باشتر سەرنجی بۆ سەرئاڵ و گۆڕی سروشت و هاتن و ڕۆیشتنی وەرزەکانی ساڵ ڕاکێشراوە • ئەو سەرنجدانە هۆیەکی گەورە بووە لە کرانەوەی ئاسۆی مێشکی ئافرەتدا و دەتوانین بڵێین کە ئافرەت لە سەرەتای مێژوودا بە زەین و هۆش تر بووە لە بەرەی پیاو و زۆر شتی بۆ روون بۆتەوە و دەستی دە کار و باری سروشتی دەوراندەوری خۆی وەرداوە و بۆ بەڕێوە بردنی ژیانی خۆی و منداڵەکانی زۆر سەلیقەی بە خەرج داوە • ژن لە ماوەی حامیلەیی و پێ هەڵگرتنی منداڵدا نەیتوانیوە زۆر دوور بڕوا • ناچار بووە لە گیا و میوەی دەور و بەری خۆی کەلك وەرگرێ و ئەگەر ئەشکەوت و غاری بەلاوە نەبووبێ دەخانووی دەستکردی خۆیدا بژی • بۆیە ژن بە یەکەم میعماری شارستانەتی ناسراوە •

لە هەمانکاتدا کە ژن ناچار لە مەڵبەندێکی بەر تەسکدا ماوەتەوە پیاو بە هۆی توانای زاتی و هەڵسووڕاوی بە شوێن ڕاو و ڕاوگەی باشتر دا شوێنی خۆی گوێزتۆتەوە و دوور کەوتۆتەوە و گەرمێن و کوێستانی کردووە و هیچ پێداویستی یەك نەیخستۆتە بیری خانووبەرە ساز کردن و زاڵ بوون بە سەر کۆسپە سروشتی یەکاندا •

هێندێك زانای بە ناوبانگ دەڵێن کە ژن بۆ یەکەمجار کاری کشت و کاڵی دەست پێکرد • مانەوەی زۆر لە شوێنێك و دیتنی شین بوونەوە و لە ناوچوونەوەی گژ و گیا و دار و گوڵ و دووپات بوونەوەی خولی ئەم رووداوە فێری کشت و کاڵی کردووە و هێندی هێندی مەیلی هەڵاتن و هات و چۆی بێ وچانی ناوە و لە شوێنێك ماوەتەوە و بە پێی جازیبەی سروشتی نێرینەکانیشی بۆ لای خۆی گەڕاندۆتەوە و لە هێز و توانای ئەوان کەلکی وەرگرتووە و بەرەو پێشکەوتن هەنگاوی ناوە• ئەو مەودایە زەمانێکی زۆری گرتووە و ژن کە بیر و هۆشی کارامەتری بووە بە سەر کۆمەڵگای خۆی دا زاڵ بووە • مێژوو نووس و کۆمەڵناسان بەو مەودایە دەڵێن دەورەی ماتڕیارکی ( دایك شایی ) کە هێشتا نووك و نیهایەتی ئەم دەورانە روون نەبۆتەوە •

پاش تێپەڕ بوونی زەمانێکی دوور و درێژ وردە وردە کاروباری کۆمەڵ بە تایبەتی بەرگری لە هێرشی دوژمنان و ڕاو و شکار و کارە دژوارەکانی ژیانی ئەو سەردەمە کەوتە دەست پیاوان و بەرەی ئافرەت هەنگاو بە هەنگاو بەرەو ژیانی نێو ماڵ و هێمنایەتی پاشەکشەی کرد و بەرپرسی ئافرەت زۆرتر بە دابین کردنی کاروباری نێو ماڵ و ئاگاداری لە منداڵ و مێرد کۆتایی پێ هات • بەو جۆرە دەسەڵات و هێز و ئیعتیباری پیاو ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر پەرەی ئەستاند و دەورانی دەسەڵاتداری پیاو بە سەر چارە نووس و کاروباری کۆمەڵدا سەقامگیر بوو • بەو دەورانە دەڵێن دەورەی پاتڕیارکی ( باوکشایی ) کە تا ئێستاش بە شکڵی جۆراوجۆر هەر بەردەوامە •

لەو دەورانەدا ئەستێرەی بەختی ئافرەت ئاوا دەبێ و ژن دەبێتە ئامرازی دەستی پیاو و ڕۆژ لە ڕۆژ زیاتر بایەخ و دەسەڵاتی خۆی لە دەست دەدا •ئەوجار پیاو بە یەکجاری بە سەر هەموو کاروباری ژیانی کۆمەڵگای خۆیدا زاڵ دەبێ و هەموو دەسەڵاتێك لە ئافرەت دەستێندرێتەوە • ژن دەبێتە خزمەتکاری بێ ئیرادە و پرس و ڕا پێ نەکراوی پیاو ومەجبوورە بەو ڕێ و شوێنە کە بۆی دیاری دەکرێ هەستێ و دانیشێ و بەو پێوە دانە بپێوێ کە پیاو پەسندی دەکا و مافی رەخنە و دەنگ دەربڕینی نامێنێ •

دەسەڵاتی پیاو لە زۆر بڕگەی تاریخی دا دەگەڵ زوڵم و چەوسانەوە تێکەڵە و ژن لە پلەی مرۆڤێکی

خاوەن ماف را تا رەدەی ئاژەڵ و کەل و پەلی ژیان دادەکشێتە خوار • ئەو جار وەك ئاژەڵ کڕین و فرۆشتنی لە سەر دەکرێ و دەبەخشرێ و بە دیاری و سەوقات بۆ ئەم و ئەو دەنێردرێ و ئەوی سووکایەتیو ناجایەزە بە سەری دێنن • بۆ کەم کردنەوەی تەوژمی غەزەب و قەهری خودا جۆر بە جۆرەکان کیژی بێ دەسەڵات و هەناسە سارد قوربانی دەکرێن • هەموو ساڵێك بۆ ئەوەی چۆمی نیل بنیشێتەوە و خودای رۆباران دەگەڵ دانیشتووانی سەرزەوی ئاشت بێتەوە جوانترین کچی وڵاتی میسریان دەرازاندەوە و بە زیندوویی دەیانخستە ناو تەندووراوی سێلاوی نیل • کاهینەکان دەپاڕانەوە کە خودای رۆ باران ئەو قوربانی یە ناقابیلەیان لێ قەبوول بکا !

ئەو جار لە هەر جێگایەك ئاگر پژان و زەلـزەلە رووی دابایە دیسان کیژی بێ دەسەڵات وەکوو بووك دەرازاندراوە و لە سەر بەردی قوربانگاە سەری لە بەدەن جیا دەکراوە تا خودایان بە وەرگرتنی قوربانی توورەیی و رقیان دابمرکێ و چیدیکە زەوی و ماڵ و ژیانی ئادەمیزاد تێك و پێك نەدەن • هەر وەها بۆ مانگ‌گیران و رۆژ گیران و هەر چەشنە رووداوێکی سروشتی دیکە کە بۆ ئادەمیزادی ئەو سەر دەمە لێکدانەوەیان دژوار بوو ، کچ و کیژی منداڵ و تازە پێگەیشتوو قوربانی دەکران •

لە شەڕەکاندا ئەگەر وڵاتێك بەرامبەر بە دوژمن تێك شکابا ، ژنەکانی ئەم وڵاتەش وەك سامان و ماڵ و ئاژەڵ بە تاڵان دەچوون و دە نێو سپای سەرکەوتوودا بە پێی سەران بەش دەکران.کچ و ژنی هەناسە سارد دەبوایە ماڵ و کەس و کاری بە جێ بێلێ و بۆ رازی کردنی هەوەسی پیاوان بەرەو وڵاتێکی غەریب و نەناسراو بڕوا •

هەر چی زەمان تێدەپەڕی باری ژیانی ئافرەت لە زۆر شوێنان خراپ تر دەبوو تا وای لێهات کە "ئافرەت بوون "بووبەدەردێك! بووبەشەرم و شوورەیی ، بوو بە هۆی سەر شۆڕی و سووکی ! دایکان دەپاڕانەوە کچیان نەبێ و لە زۆر جێگەی سەرزەویدا منداڵی کچیان دەکوشت و تەنانەت لە نێو عەشیرەتە عەرەبەکاندا بە زیندوویی زیندە بە گۆڕیان دەکردن •

داهاتنی دینی پیرۆزی ئیسلام ژنی عەرەبی لە زیندە بە گۆڕ بوون رزگار کرد • لە سایەی بیر و باوەڕی پاك و شۆڕشگێرانەی ئیسلامیدا دیسان ژن بایەخی خۆی پێدرا و خودای گەورە دە قورئانی پیرۆز دا لە زۆر جێگا دایك ستایش دەکا و لە سەر مافی ئافرەت پێ دادەگرێ و پێغەمبەری مەزن (ص) دەگەڵ یارانی سەدیق و با وەفای خۆی ئەرکی گرانی پاراستنی مافی ئافرەتیان وەستۆ گرت و بە تێکۆشانی بێ وچان و روون کردنەوەی زەمینی دوا کەوتووی خەڵکی ئەو سەردەمە ژن و ئافرەتیان لە ریزی ئاژەڵ و کەرەسەی ژیان را گێڕاوە بۆ ریزی ئادەمیزاد و دایك و خوشك بوونەوە ئەندامی خۆشەویستی بنەماڵەکان •

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە لە دەورانی باوکشایی دا بارودۆخی ژیانی ئافرەتان لە هەموو شوێنێك دا وەك یەك نەبوو • لەو شوێنانەی کە شارستانەتی و بازرگانی و شەڕی دەسەڵاتداری و لەشکرکێشی و کاری وڵات داگیر کردن پەرەی گرتبوو هێزی گرینگی کۆمەڵ هەر پیاوەکان بوون و ژن لە دام و دەزگای ژیاندا نەخشی دەرەجە دووەمی هەبوو • حەرەمسەرای پادشا و ئەمیرەکان پڕ بوون لە ئافرەتی جۆراوجۆر کە هەر یەکە لە بازارێك و شارێك بۆ دامرکاندنی ئاگری هەوسبازی پاشا کڕ درابوون • یا بە دیاری ناردرابوون • نەخشی ژن لە ژیاندا ئەوە بوو نەهێلێ تۆرەمەی بنەماڵە ببڕێتەوەوەجاغەکان کوێر ببنەوە • ژن بە تایبەتی ژنی جوان وەك کاڵایەکی بە قیمەت ئاڵ و گۆڕی پێ دەکرا • زۆر رووداوی گرینگ و دڵتەزێنی مێژوویی لە سەر وەدەست هێنانی ئافرەتی تەرزولەبار رووی داوە • زۆر جار دوو پادشای بە دەسەڵات هەزاران کەسیان لە سپای خۆیان بۆ کچێك یا ژنێکی جوان بە قڕ داوە • لە مێژووی دوور و درێژی بەشەردا تووشی سەدان کارەساتی ئاوا دەبین کە گێڕانەوە و باس کردنیان دە حەوسەلەی ئەم وتارە کورتە دا نیە •

دیارە ئەو شێوە بیروباوەرە و ئەم تەرزە رەفتارە دەگەڵ ئافرەت تایبەتی کۆمەڵگا دەوڵەمە ـ

ندەکان بوو کە دەواندا پلەی بازرگانی و ساماندای لە سەرەوە بوو • شاری گەورەی وەك بەغدا و بوخارا و سەمەرقەند و رۆم و قوستەنتەنیە و مەغریب و ئیسفەهان ببوونە ناوەندی بازرگانی و سنعەت و سپا گەری و عیلم و زانست •

بەلام لە هەمانکاتدا لە زۆر ناوچەی دیکەی جیهاندا ژیان بە رێگە و رێبازێکی جیاوازدا تێپەڕ دەبوو • لەم ناوچانەدا ژیانی خێڵەکی و عێلاتی کە لە سەر بنەمای ئاژەڵداری و کۆچەری بنیات نرابوو پەرەی گرتبوو • ژیان لەم ناوچانەدا ساکار و بێ رەنگ و بۆن تر بوو • عێل و خێڵ لە گەڵ ئاڵ و گۆڕ و سووڕانی وەرزەکاندا دەهات و چۆی بێ پسانەوە دابوو • گەرمیان و کوێستان کردن بە لەوەڕاندنی مەڕ و



ما ڵات کارێکی مۆگەر بوو • هات و چۆی بێ پسانەوە و هەڵوەدای گەرمێن و کوێستان بوون نەیدەهێشت خێڵ لە جێگایەك بنەگر بێ* و شارستانەتی برەو پێ بدا • لەو ژیانە ئەستەم و دژوارە دا هەموو ئەندامێکی خێڵ و عەشیرەت دەبا شەو و رۆژ هەڵسورێ و کار بکا و شان وە بەر بەشێك لەو ئەرکە گرانە بدا کە ژیانی خیلاتی پێ هەڵدە سووڕا • ژیانی خێڵەکی و راگرتنی ئاژەڵ تەرزە ژیانێکە کە مەجالی حەسانەوە بە هیچ ئەندامێکی بنەماڵە نادا •

لەو کۆمەڵگا خێڵەکی یانەدا دەتوانین بڵێین پیاو و ژن وەك یەك دەژیان • وەك یەك کاریان دەکردو لە خواردن و کردنیاندا جیاوازی یەکی ئەو تۆ بەرچاو نەدەکەوت • ئێستاش لە نێو عێل و خێڵی کۆچەر دا جیاوازی یەکی وەها کە بۆنی چەوسانەوەی لێ بێ لە نێو ژن و پیاو دانابینین.هەر دووك بەرەلە ژیانێکی ئەستەم و بڕست بڕ دا هەڵدەسووڕێن و هەر کە سە نەخشی پێ سپێراوی خۆی کایە دەکا • کاری دژواری شەو و رۆژی و تێکەلاوی هەمیشەیی ئەندامانی خێلات بە ژن و پیاوەوە فەرهەنگێکی تایبەتی عەشیرەتی پێك دێنێ کە دەگەڵ فەرهەنگی شارستانەتی دا جیاوازی یەکی لە پێوان نەهاتوویان هەیە •

ژن و پیاوی خێلاتی لە سەرەتای ژیانەوە تا کۆتایی پێکەوە کار دەکەن و هەڵدەسووڕێن و هەموو کات و ساتێك دەبێ لە نزیکەوە هاوکاری بکەن • شوان دەبێ مەڕ بلەوەڕێنێ ، پیاو دەبێ تفاق بۆ مەڕ و ما ڵات دابین کەن ، مەڵەغان بگێڕن ، باقە ببەستن ، شەغرە* پێوەدەن ، کیشە لێدەن، بار لێ نێن,بار بخەن ، ما ڵات ئاو دەن ، هات و چۆی شار بکەن • ئازووقە داخەن و ئاگاداری عێل و هۆز و بنەماڵە بکەن • هەر لە پاڵ ئەواندا ژنیش دەبێ شان بە شانی مەڕ بدۆشن ، مەڕ هەڵاوێرن، ریخ بڕێژن ، پەین وشك کەنەوە ، شیر بکوڵێنن ، نان بکەن ، پەنیر بگرن ، مێکەل دەرکەن ، ماڵ خاوێن کەنەوە ، خێوەت هەڵدەن ، ئاوردوو بێنن ،تەندوور داخەن ، نان بە سێڵەوە دەن ئاگایان لە بەرخەزاو و مەرە شەل بێ و ئازووقەی زستان داخەن، مامۆستا هێمن دە شێعرە بەهارینەکەی خۆی دا کە شاکارێکە لە ئەدەبی کوردەواریدا ئەو مەبەستە بە جوانی باس دەکا •

سوێن و وەنەوشە و هەمین

**کەژێ و خەندان و چەمین**
**خاسێ ، کەوێ ، خاتوو زین**
**بە پۆل دەچنە سەر نۆشین**

**زێڕن و کابان و مێرێ**
**دانیشتوون لە بەر بێرێ**
**ئەتتی دەکا هاوێرێ**
**گولێ بەرخان دەژمێرێ**

**خونچە و گولوك و گەوەر**
**شەم و کەژاڵ و دلبەر**
**زین و مرۆت و ئەسمەر**
**لە تاولێ هاتوونە دەر**

**مامز دایگرتووە شیری**
**ناك دەکوشێ پەنیری**
**ناز دەشێلێ هەویری**
**کالێ دەکا نان تیری**

**ئامان چۆتە کولێنێ**
**پەرێ مەشکەی دەژێنێ**
**بەسێ لۆرکی دەکولێنێ**
**خەیاڵ ئاوردووی دێنێ**

کاری ئافرەت دە ژیانی خێلاتی دا کاری پیاو تەواو دەکا و بە سەمەری دەگەیەنێ . بە زبانێکی دیکە دەبێ بلێین ژن و پیاو دەو شێوە ژیانەدا یا دەو سیستمیە تەولیدەدا وەك ئالقەی زنجیر بە یەکەوە بەستراونەوە و بە یارمەتی و هاوکاری یەکتر لە رەوندی تەولیدی خێلاتی دا شان بە شان تێدەکۆشن . نەبوونی هەر یەك لەو دوو هێزە دەبێتە هۆی پسانی زنجیری ژیان . من پێم وایە ژن بە ژنە کە دەژیانی ئەورۆدا کە ژیانی خێلەکی بەرە و نەمان و فەوتانە و رەسمێکی ناحەز و نالەبارە ریشەی دەژیانی خێلەکی دایە . دیتمان کە ژن نەخشی کارامەی دە تەولیدی خێلەکی دا هەیە . وەختێك بنەماڵەیەکی خێلاتی کچێکی توند و تۆڵ و هەلسووڕاو لە دەست دەدا کەلێنێکی گەورە دەکەوێتە هێزی کاری بنەماڵە و ناچارە ئەو کەلێنە بەوەرگرتنی هێزیکی تازە پڕ کاتەوە یانی ئەگەر کچێك لە دەست یدا دەبێ کچێك بستێنێ تا پەکی کاروباری نەکەوێ .

لە باری ئەخلاقی یەوە ژنی عێلاتی بە هۆی هاوبەشی دەکاردا پتەو و بە غیرەت و ئازایە . بە وەی بەرزەوە دەگەڵ کیروگرفتی ژیان بەرەنگار دەبێ ، ناهومێد نابێ ، نابەزێ و سەردانانەوێنێ . زۆر بیندراوە بۆ پاراستنی خۆی و بنەماڵە و عێل دەستی داوەتە چەك و شان بە شان پیاوان شەڕی کردووە . ئافرەتێك کە دەو شێوە ژیان و فەرهەنگەدا پەروەردە دەبێ جیاوازی تەواوی دەگەڵ خاتوونی نەرم و نۆڵی حەرەمی تاجر و سامانداری شار هەیە .

ژنی خێلاتی لە بەر کاروکوێرەوەری ناپەرژێتە سەر بە خۆداهاتن و خۆ رازاندنەوە و خۆ جوان کردن . دەورەی لاوەتی و لە باری بۆ کیژی عێل و عەشیرەت تیز تێ دەپەڕێ . خۆ نواندن و چەتر* هەلدان و ترووسکە و برووسکەی سەر دەمی لاوەتی زوو دیت و دەڕوا . کیژی جوان و جحێڵ هەر کە مێردی کرد بێ درەنگ دەکێشرێتە نێو رەوەندی تەولیدی خێلاتی و ئەندام و دەست و پەنجەی بە کار و باری زۆر و بێ پسانەوە زبر دەبێ و رێك و پێکی تێك دەچێ و کنجی پیری و ماندوویی زۆر زوو دەکەوێتە سەر روخساری و دم و ددانی هەلدەوەرێ و سەر و قژی وشك دەبێ و تێك دەهاڵێ . ژنێکی وا دیارە بێ باك و نەترس و روو هەڵماڵاوە . روو لە پیاو ناگرێ و خۆی بە پیاو دەزانێ . قسەی راستە و درۆی پێ عەیبە . سادە و سادە کارە.بە هەموو شت رازی یە . دەگەڵ فێڵ و تەڵەکە و لە بنەوە* بڕی و خەیانەت بێگانەیە . ئەوینی توند و پایەدارە و گراوی خۆی لە قوولایی دڵەوە خۆش دەوێ . بە چەنگ و ددان بە گژ دوژمن دادێ و لە ژیانی خۆی و مێردوماڵ پارێزگاری دەکا . هەر کە برێك تێوە* چوو دێتە مەجلیسی پیاوان و بیروڕای خۆی دەردەبڕێ و لە سەر پێی خۆ رادەوستێ.هێمن لە مەڕ ئەو ژنانەوە دەڵێ :

**کیژۆڵەی شۆخی جوان چاك**
**شۆڕە ژنی داوێن پاك**
**روو هەڵماڵاو و بێ باك**
**دەرەتێنن زاو و ماك**

ژنی بەیتی کوردی زۆرتر لەو چەشنە ژنانەن کە باسمان کردن • ژنی عێلاتین ، کچی عەشیرەتن ، ئەگەر کچە دەولەمەندیش بن دەگەڵ کاروکوێرەوەری بێگانە نین • سوار چاك و ئازاونەترسن ئەوینیان قووڵ و ریشەدارە •، لە لۆمەی کەس و کار ناترسن بێ باکانە بە کوڕە حەیرانی خۆیان هەڵدەڵێن و هەموو هەل و دەرفەتێك بۆ گەیشتن بەو دەکار دەکەن • دنیای ئەوان تەنیا یەك شتە • گەیشتن بە کوڕە حەیران • بە دەنگی خۆش و لاوکی ناسك و دڵ بزوێن بە یاری خۆیان هەڵدەڵێن • بەرامبەر بە دڵدار شاعیری چاکی بێ باکن • ئەوینیان پاك و قووڵ و دڵدارانەیە • لە دارەتی دەدنیایە کوڕە حەیرانێك شك دەبەن کە ئەگەر لە سەر دنیا نەمێنێ دنیا چۆلگە و بەرە هووتە • نموونەی ئەو هەستە قووڵە دەبەیتی سوارۆ دا زۆر جوان بەرچاو دەکەوێ پاش ئەوەی سوار لە شەڕی کاولە لەحسیایە دەگەڕێنەوە و سوارۆ دیار نیە • هیچ دەنگێك ، هیچ رووداوێك ، هیچ کەسێك بۆ ئایشە گوڵ بایەخیان نامێنێ ، دنیایەك کە دەنگی سوارۆی تێدا نەبێ چۆڵە ، وەها چۆڵە دەڵێی لە بنەبانی تاریخ را هیچ دەنگێك هەرگیز لە هیچ بەشەرێك هەڵنەستاوە •

**هەی نایە وەی نایە دەی نایە**
**ئەوەکیژ دەڵێ نە لە چۆلێ نە لە بەحرێ نە لە بەر پایە**
**نە لە کەناری دەکۆمەڵە سواران**
**نە لە عێلی دە بەغدایە**
**نە لە گۆشەی دە وەتاغێ**
**نە لە بورجی دە قەلایە**
**نە دەگەڵ حەزرەتی ئەسکەندەری**
**ئەگەر خەرجی دەستاند لە مانگێ لە رۆژێ**
**مالیاتی دەر دەکرد لە دنیایە**
**نە دەگەڵ رۆستەمی داستان**
**ئەگەر زگی بێزادی دەدڕی**
**لە مەیدانی دە دەعوایە**

**نە دەگەڵ حەزرەتی سولەیمان**
**کە بە زەبری تەیر و تووران**
**سێبەری دەکرد لە سەر چاوی دەبلقیسایە**
**هەی نایە وەی نایە ، دەی نایە**

**دەنگی چووکەڵ و چووکەلە سواری من**
**لە مەیدانی دەکوڕە بەبەئیان نایە**

بەڵێ وایە ، دنیایەکی کە دەنگی چووکەڵە سواری لێ نیە ، چۆلگەیە ، کاولە کۆنێکی بەتاڵە ، ئاشێکی ئاولێبڕاوە ، ئەسکەندەر بە هەموو جەلال و شکۆیەوە ئەگەر دەنگی چووکەڵە سواری لە لا نەیە ، سولەیمان و بەلقیس ، دنیا بە بەڕ و بەحرەوە بە بێ دەنگی ـ چووکەڵە سوار کڕ و ماتە،چۆلگەیەکی تاریك و بێ رۆچنە •

ژنی بەیتی کوردی وەها ژنێکە،ئەویندارێکی سەوداسەری سەرلێشیواوە کە دنیای ئەو تەنیا بە تیشکی رووی چووکەڵە سوارێك روون دەبێتەوە و بەس• دەنا نە دەنگ دەنگە و نە نوور رووناکە و نە رۆژ تین دەدا •

ژنی بەیتی کوردی ژنی رەدوا کەوتوو نیە ، ژن بە ژنەی پێ نەکراوە سەرکوت نەکراوە• ئەگەر بە زۆر لە گراوی بێ بەش کراوە • تێکۆشاوە هەر چۆنێك هەیە بەند و زنجیر بپسێنێ و بگاتە دڵداری خۆی • بە سەبرە ، رادەوستێ.راوتەگبیران دەکا پرچی سپی دەهۆنێتەوە ، جووتە مەمکی پاوان کراوی دەژێر کراسی مەحمەڵ کەتانیدا زەنگ هەڵدێنی • ئەوانە هەموو روو دەدەن بەلام ئەو چاوەڕوانە ، یا کوڕە حەیران یا هیچکەس ، یا بە دڵدار گەیشتن یا مردن !

ئەو ژنانەی دە بەیتی کوردیدا رەگەڵ قارەمانانی داستان دەکەون هەمیشە گراوی و دەزگیران نین جاری وایە دایکە کە شا ژنی بەیتە و بە کوڕی کوژراوی خۆی هەڵدەڵێ و ئاور دەجەرگ و هەناوان بەر دەدا.جاری وایە خوشك بۆ برا یەخە دادەڕێ و سەردە هەش دەنێ و بە زبانی بەیت و بالۆرە شین دەگێڕێ • وەك دایکی میر سێوەدینی کە بە تازیە باری بە کوڕی خۆی هەڵدەڵێ •

**هاوینێك گەیوەتە دایکی میرسێوە دین بەگی**
**چەند هاوینێکی گەرم و دژوارە**
**دایك سەری بێ بە قوربانی سواری لەشین بۆرەی**
**لە بن خێوەتی وەزیری بەغدایەی**
**دەکرد تەقڵە و هاوارە**
**خودا ماڵە رۆمیان خراکا بە دەنگێکی بلێند هاوار**

دەکەن

" سەری میر سێوەینیــان بــڕی ،
قالبیــان لــە مناران فــڕێدا خــوارە
لــەو دەوری هــەتــا ئــەو زەمانــی
بابــادەمــی ، هــەتــانــۆشیروانــی
هیــچ کەسم نەدی وەك میــر سێــوەینــی نان بــدە
ســەغــی بــداتــەوە نــانــی
ئینجا بەگەمــە خــاتوون دەڵــێ
" خوشکــی گەورەی خــانــی
بلا ئــەستــۆی خۆمان بەرینە سەر کووپەڵەی خەی ،
ئەتۆ تــێ بنــێ بەرسەری ، ئەمن تێ دەنێم بەرتانی
ئەستۆی خۆمان هەڵبڕیــن بــە تیخــان
ســەری خــۆمان بتــاشیــن بــە گــوێــزانــی
ئەوڕۆ دوو ڕۆژە نۆڕە نۆڕی تاژی و تولان
نایــە لە دەرکی ئۆتــرە خــانــی
دایك سەری بــە قوربــانی ســواری شین بۆرە بێ
وەکوو لــە بن خێوەتی وەزیری بەغدایە دەیکرد تەقڵە و جلیتــانــێ
ڕۆڵــە بە گەمــێ گــەورەی وەرە کوێنی دەبەریکەین ئـــەو جــارە !

دەبەیتــی کاکە میرو کاکە شێخ دا کـــــــە بەغــدان و ئــەستــی شینــی برایان دەگێڕن غەم وپەژارە ئەوەندە زۆرە کە خوێنــەر یا بیــەر هەر بە بیستنـــی یەکەم شێعــری بــەیــت کوڵــی کریانی هەڵدەستـــێ و فــرمێســك دەچاوی دەگەڕێ ٠

هەی ڕۆ ٠٠٠ هــۆ ٠٠٠ هــۆ ٠٠٠ وەی
ئەستــی دەڵێ خوشکــێ بــەغــدانــێ
سەرشینــێ ، قەڵەندەرێ،یابان وێــرانێ
بێ کەســێ ، بێ دەرێ ، بــێ خودانــێ
وەرە یەکمان بچینــەوە ئەستەمبوولــێ
یەکمان بچینــەوە کن شازادە و شای تارانێ
دەبا بچینــەوە ســەر کووپــەڵەی دەخەخانێ
ئەتۆ لێدەوە لکــی دە دەســرۆکــەی
ئــەمنیــش لێــدەدەمــەوە لکــی دەکۆڵــوانــێ
نـــاوەڵــلا دەلامــلانــێ
ئەمن داخێك و ســێ سەد، مەخابەتی دە دنیایـــــە م دەکــووژی
بــۆ کــاکـــە میــرو کــاکــە شێخــم
هــەی ڕۆ کاکینـــە ڕۆ بــراینــە ڕۆ
ئــەگەر راستــە و ئــەگـــــەر درۆ
وەســەری ئەستــی قەڵــەندەر و دەکرد خۆڵی دە کۆ کۆ
هەی ڕۆ ٠٠٠ هۆ ٠٠٠ هــۆ ٠٠٠ وەی
ئەستــی دەڵێ خوشکێ بــەغــدانــێ
لە بنــی گوێ یانــم خۆش دێ
پڕمەی بۆر و بدەوان دەگەڵ ســەودای پیرە سازی
خۆ ئەمن زەمینێ خۆم دەداوە
بەر دەرکی دیوە خانــی کاکە میر و کاکە شێخان
ئەوە بــرای مــن ســوار دەبــوون
دەیانکــردەوە بــە تەقڵــە و ڕەمبــازی
ئەو ڕۆکانە کەوتوونەوە بەراوی ورچ و بەرازی
گۆشتیــان لێ دەگــرن بە مووکێشــی
هەرامەتی هــەر بــە گــازی
یارەبی " ئاودەل گۆران " بۆت بەڕی بی
تیرەکەی دەحوسێنی غــازی
هەی ڕۆ کاکینــە ڕۆ براینە ڕۆ
ئەگەرراستە و ئەگەر درۆ
وەســەری ئەستــی قەڵەندەر و دەکرد خۆڵی دە کۆکۆ

دە ژمارەیەکی زۆر لــە بەیت و باوەکانـــــی کوردیــدا نــەخشــی ژن گەلێــك گرینگ و بەرچـــــاوە ٠ دەبەیتەکانــی جۆڵنــدی و مەم و زین و مەحمەڵ و برایمی دەشتیــان ، و لاس و خەزاڵ و برایمــۆك و زەمبیــل فــرۆش و فەرخ و خاتوون ئەستی و شیرین و فەرهــاد و لەیلــی و مەجنوون و زۆر بەیت و باوی دیکــەدا ژن نەخشــی هەرە گرینگــی پــێ ئەسپێردراوە و زۆر جــار نەخشــی دەرەجەیــەکــی هــەیــە ٠

هەر وەك دەزانین بەیتەکانی کوردی زوربەیان پایانێکی تــراژیکیان هەیــە و دەتوانیــن بڵێین بەیــت دە ئەدەب و فۆلکلۆری کوردی دا بەشی تراژێدی یـــان پێــك هێناوە ٠ دە زوربــەی بەیتەکانــدا قارەمانـــــی داستــان بە ناکامی دەکوژرێ و لە ناو دەچێ و غــەم و پەژارە بۆ خوێنــەر بە جێ دەمێنــێ ٠ هێندێك لــــــە بەیتــەکان لــە ســەر ڕووداوێکی مێژوویی وەك شــەڕی قەڵای دمدم لــە نێــوان شاعــەباس و ئەمیرخانـــــی برادۆست دا هەڵبەستراون و هێندێك وەك جۆڵنـــدی

بنەما ی ئاییینی یان هەیە و بەشێکی زۆریش لە سەر ئەوین و دڵداری داڕژاون ئەوەی شایانی باسە دە هیچ کام لەو بەیتانەدا ژن یا کچ چ دەوڵەمەند چ فەقیر چ ئاغا بێ و چ ئەمیر مەگەر بە دەگمەن دەنا تووشی داوێن پیسی و کاری ناحەز نابن •

هێندێك كەس دەڵێن دە هێندێك بەیت و باوی کوردیدا ژن خۆی زۆر رووت دەکاتەوە و سینگ و مەمکی خۆی دەکاتە دیاری بۆ دڵداری خۆی. وەك دەسوار ۆ داهاتووە •

**ئەوە ئایشە گوڵم دەڵێ ئەمن رۆژێکی دانیشتبووم لە بەر بێرێ ، ناوەڵلا بێرکەی دەبێر مانگانە**

**ئەوە ناسکە سواری من بەوێ دا دەهات داوای دەکرد بۆ تەنیا ماچێکی هەر بە سەرێکە شینە بە ملێکی بە کوێنە نەمدەدایە ،**

**ئەگەر بێت و ئەو ناسکە سواری من بێتەوە لەوی سەفەرێکە گەورە و گران و لەوی سەفەری کاولە لە- - سیایە**

**ئەمن سینگۆڵەی خۆمی بۆ دەکەمەوە بە باغچۆڵە ، باغچۆڵەی بە بێستانە ، هەر وەك مەلایەکە قورعان رەوانە ، هەموو شەوێ دەسێ شەمۆیێ و رۆژی دە جومعەی تێی دا بکا موتالایە سوارۆ ! هەی سوار ! مەڕۆ لە منی بە تەنێ •**

ئەو سکالاو دەردە دڵە کاتێك دەگوترێ کە سوارۆی خۆشەویستی ئایشە گوڵ کوژراوە • بە تیرو شیرو رمبی دوژمن ئەنجن ئەنجن کراوە • بە کوللەی قەرەبینایە سینگی هەڵدراوە • کۆلـ*ـلارە بە برینی دا ئەم دیو ئەو دیوێ دەکەن • ئەویش چ سوارێك چ شۆڕە سوارێك • وێنەی لە نێو هەموو سواران دانیە • لە هەموو سواران جوان ترە، وێچوو تر و ئازاتر و هەڵکەوتووترە.وەك ئایشە گوڵ خۆی دەڵێ :

**کیژ دەڵێ سواری من سوار بووە**<br>
**لە جوانوو ماینێکی شینکی ئەسعەد بەگی یە**<br>
**کلك و یاڵ بە تەڕدی یە**<br>
**دەپێی دایە جووتێ چەکمەی دە ئیسماعیلی یە**<br>
**بە سەر شانیەوە کەوڵێکی دەغەزمیە**<br>
**ئەگەر لە جوان چاکی یەی دەپرسی**<br>
**ئەڕ سەلانی رۆمی یە**<br>
**ئەگەر لە مەرد ئازایی یەی دەپرسی**<br>
**لە سێ هەزار کەسی پشتەوە کردنی نیە**<br>
**ئەگەر لە جوان چاکی یەی دەپرسی**<br>
**مەنگوڕ و مامەش و پیران**<br>
**زەرزا و بۆڵی و ڕێبۆکری و باڵەکی**<br>
**زۆسکی و مامالْ و هەرکی**<br>
**سیدا و مامکۆ و مەندە و مەرزە و گرتیلان**<br>
**هەر بە عام سوارێکی وای تێدا نیە**<br>
**ئەگەر لە نێو نیشانی سواری من دەپرسی**<br>
**شەدەی کورووسینە**<br>
**کەواو پاتۆڵی دەمەر قوپانی یە**<br>
**لە سەر کۆشیەتی رمبێکی ئەبوو تۆپی**<br>
**حاجی نسیری هەژدە قەفی یە**<br>
**دە بەر خۆی چەقاندووە خەنجەرێکی قەرە خوراسان**<br>
**لەوی دەسك دەنێرووی یە**<br>
**لە جەنگەی هەرایە مەغلووبی دا**<br>
**لە کەناری سواران دێت و دەچیە**

کاتێك سوارێکی ئاوا پاڵەوان و هەڵکەوتە و بەرچاو دەکوژرێ و لە کالانی زینی دەترازێ و سەرەنگری دەبێ • لە کاتێکدا دوایین پشووی ژیان دەکێشی و بە ئێشی هەزار برینەوە لە مەیدان کەوتووە ئایشە گوڵی لە بیر نەکردووە و دەڵێ :

**هێندەی هەمن هێندەی دیش بان پێم چ نەبوو**<br>
**ئەما لالْ بەئەلعان چاوم لە کو چکاورێکی**<br>
**گراویلکە کەی خۆم نیە**

ترا ژێدی دەکاتە ئەو پەڕی خۆی و غەم و پەژارە تا ئەوبارستایە هەڵدەچێ کە هیچ ئادەمیزادێکی دڵڕەقیش ناتوانێ فرمێسکی پەژارە هەڵنەوەرێنی و بە دڵ و بە کوڵ بۆ سەرەنجامی تاڵی ئەو کوڕ و کچە نەگری • دێرەدایە ، کە سینگ و مەمك و لەشی ڕێك و پێك و لە باری ئایشە گوڵ یا هەر ژنێکی بەیت دەبەرامبەر قورسایی و بارستای رووداوی دڵتەزێن دا هێزی سەرنج راکێشانی نامێنی و بە تەواوی لە بیر دەچێتەوە یا لە بەر چاو دەکەوێ •هونەری بەیتی

کوردی دەوە دایە کە خۆی سانسۆر ناکا . بێ پەروا بە چاوی جوان و بسکی لوول و بەژنی باریك و لەش و پەیکەری لەبار هەڵدەڵێ بەڵام کاتێك چیرۆکە بەیت بە کۆتایی دەگا چارەنووسی دڵدار و گراوی ئەوەندە غەمبارە کە ئەو شتانە هیچ بایەخێکیان بۆ بیسەر یا خوێنەر نامێنێ و تەنیا غەم و پەکوو پەکووی دڵتەزێنە کە بە جێ دەمێنێ . من پێم وایە ئەوە تایبەتمەندی یەکی بێ وێنەی بەیت و باوی کوردی یە و دە ئەدەبیاتی گەلانی عالەمدا وێنەی زۆر کەمە .

لە کۆتایی ئەم باسەدا وەبیر هێنانەوەی ئەم مەبەستە پێویست دەزانم کە زوربەی ژنانی بەیتەکان دیندارانێکی ئەویندارن و زۆر بە دڵ بۆ کورە حەیرانی خۆیان لە بەر خودا و پێغەمبەر و شێخ و مەشایخان دەپارێنەوە کە سەرکەون و بە سڵامەتی بگەڕێنەوە . دەبینین کە ئایشە گوڵ سینگی خۆی دەکاتە لاپەرەی قورئانی پیرۆز کە فەقێ یان تێیدا موتا لایە دەکەن . ئەو شوباندنە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو ئەوینیکی پیرۆز و ئاسمانی یە ، ئەوینێکی خودایی و دوور لە هەوەس و بڵحی و داوێن پیسی .

**دڵم دێشی سەرم هەڵنایە**
**لە بەر بارستی دەغمەمان**
**ئەوەڵ بانگم وەبەر بینایی چاوان**
**ئەوی دیم وەبەر رەسووڵەڵڵایە**
**وەرە ئازیزێ**
**بانگی دیم وەبەر حەزرەتی مووسایە**
**هەزار و یەك کەلیمەی عەرزی بینایی چاوان دەکرد**
**لە سەر کێوی تووری**
**کەلیمەی دە ( لا الە الا اللە ) یە**
**وەرە ئازیزێ**
**بانگی دیم وەبەر حەزرەتی یوسیی**
**کە جوانی وی مەشوور بوو**
**لە سەر ئەوێ کاولە دنیایە**
**بانگی دیم وە بەر ئیمامی عومەری**
**دەیکرد فەتحی دەگەڵ خەزایە**
**وە بەر ئیمامی عەلی**
**ئەگەر بە رۆژی جومعان**
**سواری دوڵدوڵی دەبوو**
**بە عەزمی دەخەزایە**
**وەرە ئازیزێ**

بەیتی عەبدورەحمان پاشای بەبە بە موناجات و گازە دەست پێدەکا .

**خالق هەر ئەتۆی قادر**
**رەبی هەر ئەتۆی قادر**
**چەند باقی و چەند نادر**
**تۆی عەرز و ئاسمان راگر**
**هەشتا هەزار عالەمە**
**بێ شکە وەڵڵا زیاتر**
**ئەمنیش یەکم لەوان عالەمان**
**خۆ دەگرم لە هەموان کەمتر**
**سوجدەی شوکرێم لە سەر بوو**
**نەتخولقاندم بە کافر**
**لا الە الا اللە**
**سەد هەزاران جار شوکر**
**تۆی ئەوەڵ و تۆی ئاخر**
**تۆی باتین و تۆی زاهیر**

بەمجۆرە دەبینین کە بەیت و باوی کوردی بە هەوێنی ئیمان و دینداری هەوێن کراون و ژنی بە بت ژنێکە بە ناموس و بە حەیا و داوێن پاك و خۆڕاگر دە بەرامبەر هەوەس و ئامەزرۆیی دا ست و شلە پەتە نیە ، خۆی نادۆڕێنێ و گەورەیی و داوێن پاکی خۆی لە دەست نادا . عاشق و ئەویندار ی پیاوی پیاوە و دەگەڵ هەنیوە و بۆرە پیاوان دەست تێکەڵ ناکا . دایکی شێرە کوڕانە و خاوەنی هەستی پاك و گفتی پایەدار و کەم شەرتی و بێ بەینەتی لە ئاکاری دا نیە و شان بە شانی مێرد و برا و کەس و کاری خۆی بەرەنکاری دژواری یەکانی ژیان دەبێ و بۆ سەر بەرزی بە ئاسانی سەر دادەنێ .

دەمەویست بۆ پەرە پێدانی ئەو باسە یەك یەکی ژنانی بەیتەکانی کوردی بە شاهید بێنمەوە بەڵام هەر وەك دەزانین ئەوە لە باری بارستاوە بۆ گۆوارێك نابێ و دەبێ بکرێتە پێخۆری نووسینی کتێبێکی تایبەت ، کە پێویستی بە زەمان و کار لە سەر کردنی زۆر هەیە .

کاروانی شیعر

## تاسە

فەرەیدوون ئەرشەوی — سنە

کەشتی هەوری پڕ بارانم
شەپۆلی خەم
بۆ بەندەری گریان ئەمبا
هەوارێکم
پڕ نێرگزی چاوەڕوانی
رەشماڵی چاوەکانی تۆ
مێرگی تاسەی تێژ نەشکاوم
بە جێ دێڵی و
مەیلی دەشتی گەرمیان ئەکا

## نامۆیی

بژیۆ «نۆرویژ»



لە ئێوارەی ئەم شارەدا
ئەوینێکی شینم بینی
لە دار تەلی شەقامەکان هەڵواسرابوو
زەق زەق لەچاوم ئەڕوانی
من خۆ تینووی خواردنەوەی ئەم شەڕابە کۆنە نەبووم
من سەر خۆشی ئەم ئێوارە تارەنەبووم
...انم پێکەنینی ئەو منداڵە خنجیلە بوو
کەبەرەنگی رەشی بۆمبا
لەسەر لێوی هەڵپڕووسکا
من تامەزرۆی ئەم ژیانە پڕلە یاو ولەرزە نەبووم
سەرمای زریان بەرەو ئێرە هەڵیگرتم
قارەمانی چیرۆکێك بووم
کە کۆتایی پێ نەدەهات
دەستی نووسەر بۆ تەواو بوون پەلی گرتم
چاوەڕوانی ئەو رۆژە بووم
کە تۆ بڵێی وکۆتایی بێ ئەم ژیانە تەنیاو دوورە
تۆ نەهاتی و
ژیان هێشتا تامەزرۆیە
دەنگێ لەوێ بێ بەرە ولام
چاوم هێشتا چاوەڕوانە
تۆبیشکێنی تەنیایەتی ژووری تەنیام
خۆتائێستا هەواڵم بووی
جارێکی تر وەکوو ترپەی بارانی شەوبەلاوێنە
خۆ تائێستا خەیاڵی کاتی تەنیایی شەوانم بووی
جارێکی تر لە سەربالی هەڵۆی خەیاڵ بەفرێنە
نەتزانیوە
ئەم ژیانە
تەنیا یەتی دەسکەوتیەتی
لەتەنیایی ئەم ژینەدا
تاکە شیعر ێکیش بۆم نایە
خۆ تائێستا هەواڵم بووی
لەبێ خەوی ئەم شەوەدا
بەکەرە خەو بەئاهەنگی لایەلایە
چۆن باوەڕکەم
ئێتر رەنگت نابینمەوە
بە خەونەبێ
چۆن باوەڕکەم
بیرت ناکەم جارێکی تر
بەشەونەبێ
باوەڕناکەم
باوەربکە
وەك مرۆڤێك سەرەمەرگ
گیانم نادەم بە دەستەوە
تا جارێ تر سووری روخسارت نەبینم
گیانم نادەم بە دەستەوە
تا جارێ ترسەر نەنێم بەسنگتەوە
گیانم نادەم بە دەستەوە

## دوو دڵۆپ فرمێسک

دانا ـ ک ـ «ئێراق»

بەفری بێ گەرد تارای عیشقەو
شاری ڤیەنناش گراوی
پەنجەرەی لێڵ چاوی منەو
غوربەتیش مژ و هالاوی
با ئەم شارە نازداریش بێ
شاری دڵم دیل و بەندە
شارەکەی من
شاری عیشق و
خەمی سوورو
ئاسۆی دوورو
زەردە خەنەو
بەفرو خوێن وزەماوەندە

## سەفەر

ژیلا حوسێنی «سنە»

ئاسۆ لە بیری سەفەرا
ئامێزی خۆی لە شاخ و هەر دو کێو ئەدا
کانیاوی روونـاکی هیوا
کچێنی خۆی لە باوەشی زەریای پیرا
ئەدا بـــە بـــا
گولاڵە خۆی رائەژەنێ
چی شك ئەبا ، لە ناز و عیشوە دای ئەدا
جا شەرم ئەکا
شەونمی شەرمی گولاڵە
گۆنای گەشی لێ تەڕ ئەکا
دار خۆی ئەدا بە دەم باوە ، بایش هێواشێ
پرچەکانی شانە ئەکا
ئینجا لە ئاوێنەی چەما
تێر سەیری با لای خۆی ئەکا
کاتێ شاعیر سەفەر ئەکا ، تەنیا دڵی لە گەڵ ئەبا
کە چی لەو پەڕ کە هاتەوە
جانتای شێعری لیپالیپە
هەزار وشەی ئاگرینی
بە دەم خامەکەوە ئەدا

## سەرنج

کۆترێکی سپی بێ لان
لەسەر ئەستوونی تێل دڕوو ،
هەڵکوڕمابوو
بە سەرنجێ ، کە دەت بینی
رقی دەروون و گریانی
لە وێرانەی گوندی سووتاوی
دەڕوانی !

رەحیم لوقمانی «سەقز»

## «هیوا»

(١)
هەمووشەوێ
هیوای کوڕم
دەست لە ملی نانێ دەکا و
لە سەر " کوێپانەکەم* " دەنوێ
خەونی چای شیرینێکی تر
لە قاوەتوونا* ، دەبینێ !
(٢)
کانیەکانیان داپلۆخان
جۆگە وهەسێل* ، ئاخنراون
زەوی دەمم
بۆئەوەی ، بگەم ، بە زەریا

سالح سووزەنی «سەقز»

شەوی تاریك و بێدەنگی
هاژەی رووباری یەکڕەنگی
لەناو کووچەی خەیاڵی تۆم
بەیادی تۆم بە یادی تۆم

جامی مەی بوو لەسەردەستم
ئەو بووئاوات ئەوەبەستم

سوێند بێ بە گولاڵەی سووروجوان
هەرتۆی تەنیا مەبەستی ژیان

قەرار وجێژوان و دیدار
لە ئاغەڵ وپەناو پاسار

فرو فێڵ بوو لە گوفتارت
ئەسیرگرتن بووە کارت

عومەر حیسامی «بۆکان»





# ڕێنوێنی ئەدەبی

زۆریەك لە دۆستان نامەمان بۆدەنووسن ودەپرسن کە بە لای ئێوەوە شێعری کلاسیك باشترە یا شێعری نوێ. مەبەستیان ئەوەیە کە ئێمە شیعری کلاسیك زۆرتر چاپ دەکەین یا شێعری نوێ. ویستمان لەوژمارەیەدا ئەوە بە خوێنەرانی خۆشەویست رابگەیەنین کە بەلای ئێمەوەوە جوانی و نێوەرۆکی شێعر زۆرگرینگە. ئێمە هیچ شێعرێك لەبەر ناوەکەی چاپ ناکەین. شێعری نوێ ئەگەر جوان وشاعیرانە وپڕنێوەرۆك نەبێ بەکارنایە وشێعری کلاسیکیش هەروەها ئێمە بیروڕای خۆمان بە سەرکەسدا ناسەپێنین، شاعیر دەبێ بۆخۆی شێوە وڕێبازی خۆی بدۆزێتەوە. شێعر شتێکی سفارشی نیە. شێعرێك کە لە دەروونەوە هەڵدەقوڵێ وهەست وسۆزی خاوەنەکەی دەردەبڕێ، دەبێ لە ئاکامی بیرکردنەوە وهەڵبژاردنی خودی شاعیرەوە بێ و ئەگەر داسەپێنرابێ ، دەبێتە شتێکی دەستکرد . شاعیر ئەگەر سەبارەت بە سەبکێکی شێعری هۆگری پەیدا دەکا دەبێ وەدوای کەوێ ولێی وردبێتەوە وهەڵیەنکێنێ. بۆ ناسینی هەوڵ بداو لەلایەنە باش و خراپەکانی ئەوشێوە شێعر وتنە وردبێتەوە. زۆرکەس کەلەسەرەتاوە شێعری کلاسیکیان نووسیوە، ئێستا تەنیا بەمەسڵەحەتی ڕۆژ دەست دەکەن بەنووسینی شێعری نوێ بێ ئەوەی بزانن دەیانەوێ چی بڵێن. هەروا لە خەیاڵی شێعری کلاسیکدان وەزن لەبەرچاویان سەما دەکا. هاوکات دەگەڵ نووسینەکەی هەوڵێ تەقتیعەکەی* دەدەن و ······ ئەوبەڕێزانە تاڵە و حاڵە دابن ناتوانن شێعری نوێ بنووسن.

پێویستیش ناکا هەمووکەسێك ببێتە شاعیرێك لە زەمینەی شێعری نوێدا. ئیزن بدەن شێعرەکە بۆ خۆی شێوەی خۆی ببینێتەوە. بەڵام ئێمە پێشنیارێکی دیکەتان پێدەکەین ئەویش ئەوەیە کە بە وردبینی یەوە موتاڵای هەموو سەبکەکان بکەن. لایەنە باش و خراپەکانیان پێکەوە هەڵەنکێنن و دوای زانستێکی تەواو یەکێك لەو سەبکانە هەڵبژێرن. ئەگەردەزانن لە داوی وەزن وقافیە داماونەتەوە و قسەی دەروونتان بەتەواوی پێناکرێ هانابەرن بۆشێعری نوێ. بەڵام پێتان وانەبێ شێعری نوێ کوتن ئاو خواردنەوەیە. بە پێچەوانە شێعرێکی نوێی پتەو زۆربەچەتووی لە دایك دەبێ. دیسان باشە لە سەبکی کلاسیکدا ئەگەر وەزن وقافیە لەبەرچاوگیرا وشێعرنەبوو دەڵێن ئەوشتە نەزمە. بەڵام لەشێعری نوێدا ئەوەش نیە. مەگەر پیاوەتی بکەین وبەشتی بێ نێوەرۆك وکز بڵێین مێعر!

شێعرێکمان لە لایەن کاك "ئاشنا"وە بەدەست گەیشتووە کە لەباری سەنعەتی شێعری یەوە تەواوە ولەزمان منداڵێکیشەوە(وەك بۆخۆی نووسیویە)ناحەزنیە :

**من منالێکی زرنگ وهوشیارم**
**چالاك وژیرو ئازا وبەکارم**
**وەك نەمامێکم لە باخی ژیان**
**تازە پێ ئەگەم زۆر خنجیلەوجوان**
**هەرلەئێستاوە رەوشەنە بیرم**
**ئەچمەوە سەر ڕێی باب وباپیرم**

تائێرە هەڵەی تێدانیە بەڵام لەو بەیتەی ژێرەوەدا نووسەرتووشی سەرلێ شێواوی بووە وبەزۆری وشەی "ناسیوە"ی لەنێو شێعرەکە پەستاوتووە :

**مێژووی خەباتیان بەخوێن نووسیوە**
**خۆیان بە زۆربەی گەلان ناسیوە**

مەسرەعی دووەم لە باری دەستووری یەوە تەواو نیەونێوەرۆ - کەکەشی قسەی لەسەرە. مەبەستی

شاعیرئەوەیە : خۆیان بە زۆربەی کەلان ناساندووە. بەلام لەبەر قافیە فێعلەکەی تێك شکاندووە و شێعرەکەی عەیب دارکردووە.

یا دۆستێك بە نێوی کاك رەحیم بەسیری لەسەقزەوە شێعرێکی کلاسیکی بە نێوی " نەورۆزی کوردان " بۆناردووین کە لە مەسرەعێکیدا هاتووە:

**وەنەوشەی جوانی سەرچیای کێوان!**

ئێستاش نازانم سەرچیای کێوان یانی چی؟رەنگە ئەگەر وانەنووسرابا شێعرەکە لەنگ بوایە.

شێعری "شوان"ی کاك ج. د. لە پیرانشارەوەش نەیتوانیوەخۆی لە داوی هەڵەو پەڵە بپارێزێ و هەرچەند هەتا دوایین پیتەکان بەماتە ماتە خۆی لە چنگ وەزن و قافیە پاراستووە بەلام لەدواقۆناخدا " رەدیف" پێشی گرتووە و تاوانباری کردووە و ریسەکەی لێ کردۆتە خوری:

**بەراستی هەرئەتۆی شوانی خەمی ژین**
**خەمان لێدەخوری تائاسۆو مەکۆی ژین**

کەس ناتوانێ بلێ ئەوبەیتە ناسك خەیاڵی تێدانیە.بەپێچەوانە زۆریش جوانە.

بەلام بە پێی ئەو رێ وشوێنەی بۆشێعری کلاسیك دانراوە، بە شێعری داناتێن. هەڵەی تێدایە . " ژین" رەدیفە و دەبوایە وشەکانی بەرلە"ژین" لەهەردوو مەسرەعدا هاوقافیە بان ،لەحاڵێکدا "خەمی "دەکەڵ "مەکۆی"هاوقافیە نیە. دیارە کە شاعیری ئەوبەیتە سەرەرای خۆش زەوقی سەنعەتەکانی شێعری کلاسیك نازانێ. چونکە لەیەك دووجێگای دیکەشدا لە و شێوە قافیە تراندن ووەزن شکانە - نەی هێناوەتەوە.مەبەستی ئێمە ئەوەیەکە ئەو چەشنە لاوانە رێگای خۆیان بدۆزنەوە ولەپێشدا بە ئاکامێك بگەن پاشان دەست بکەن بەشێعرنووسین.دەبێ ئەوە بزانن کە شێعری پێ دەنووسن.

ئەوەمەسەلەیە تەنیا لە شێعری کلاسیکدا وەبەرچاوناکەوێ.بەڵکوو لەشێعری نوێشدا هەروایە. زۆر سووژەی جوان کەوتۆتە دەست لاوێکەوە بەلام نەیتوانیوەشێعرێکی باشی لێ سازبکا. شتی زیادی پێوەلکاندووە. وبەزۆر قافیەی بۆ هێناوەتەوە. شێعری نوێی نووسیوە وکلاسیکی بیرکردوتەوە..

بۆوێنە بڕواننە ئەو پەیامە جوانەی ئ. ج لە سەقزەوە:

**هاوژینەکەم**
**دەمەو بەهار کاتێ رووبار**
**بەهێچ جۆرێك**
**نادابوار**
**بەلێن ئەدەم :**
**بۆهات وچۆی ئەتۆی هاوراز**
**لەشم بکەم بە پردەباز**

وشەی" ئەتۆ" خۆی لەوناوە دا قوت کردوتەوەولەجوانی شیعرەکەی کەم کردوتەوە.

دۆستێکی دیکە بە نێوی پەکەر شێعرێکی بۆناردووین:

**مناڵەکان مناڵەکان**
**مناڵە خوێنجیلانەکان**
................

داوای بیروڕادەربڕینی لێکردووین . لەو لامەدا دەڵێین کاك پەکەری بەرێز پاش خوێندنەوەی شێعرەکانت ئێمەش بووین بە هاودەردت.

برایەکی دیکەمان بە نێوی ئ. بەیانی چەند شێعرێکی بۆ ناردووین. رەکەی شێعری لە بەرهەمەکانیدا دەبینرێ . زەوق و هەستێکی جوانی هەیە. بەلام هێشتا پتەو نەبووە. لە هێندێك جێگادا رستە ووشەی زیادی وەبەرچا و دەکەوێ.

**ئێمە شاخین، داخین،بەردین**
**جەماوەری گەلی کوردین**

ئەوشێوە دووپات کردنەوەیە کزی شێعردەکەیەنێ.شاعیرکاتێك دەڵێ ئێمە"شاخین" دیارە کە"بەردیش" هەین " مەگەر "شاخ" لەکۆمەڵێکی زۆر بەرد پێك نایە. کەوابوو ئەوە زیادی یە. یا لەرستەی دووهەمدا کوردایەتی یەکەی جوان نەگەیاندووە "جەماوەری گەلی کورد" دەستە - واژەیەکی شێعری نیە.بۆناساندنی گەلێك دەبوایە شاعیرانەتربۆ ئەو مەبەستە چووبا . دەنائەگەر هەرقەرارباکوردبوون بگەیەنێ ئەوەبەس بوو کە بڵێ: "کورد ین " بەلام باقی شێعرەکە جوانە و چاوەروانی بەرهەمی جوانتری ئە و بەرێزەش دەکەین. هەروەهالە نامەی کاك "بەیانی "دانووسرابوو کە گوندی "نێ"ی ناوچەی مەریوان شاعیری باش وهەڵکەوتەی لێ یە کە بەرهەمی زۆربەنرخیان نووسیوە بەلام هەر وانەناسراو ماونەتەوە . ئێمە داوا لەوبەرێزانە دەکەین کە شێعرەکانیان بۆئێمە بنێرن هەتا لاپەرەکانی " سروە"ی پێ برازێنینەوە.

# کەڵ و شێر

## ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی

ئەحمەد شەریفی

کەڵ وشێر ، چەکامەیە کە. کە لەموکریانـدا بە "بەیتی" کەڵ و شێربە ناوبانگە،بەلاّم بە بروای من، لەراستی دا .ئەم چەکامەیە شێعری شاعیرە و (بەیت) نیە وشاعیرە کەشی (ئەحمەد حەلوا) یە.

( ئەحمەد حەلوا ) خەڵکی گوندی رەحیم خانی بۆکانی بووە ، دەگێڕنەوە رۆژێکی بۆتریّ فرۆشتنی دەچیّ بۆ گوێگجەلی ،لە سەر رێگای گامیش گۆلی وبرایماوا ،دەگاتە کۆنە قەلاّیەك کەپیّ دە لێن قەلاّی هیلاکۆ، لە بەردەرگای ئەم کاولە کۆنە قەلاّیە، بەردێکی لیّ بوو، کە وێنەیی کەڵ و شێرێکی لە سەر هەڵکەندرابوو.

(ئەحمەدی حەلوا ) ی ماندووومردووکە ئەم لەوحەیەی دەبینیّ ولە بەرسیبەری کۆنە قەلادادەنیشیّ ئەم چەکامەی کەڵ وشێرەی دادەنیّ.

وەك لە چەکامەی ( کەڵ وشێر )دەردەکەو-یّ گۆیائەم لەوحەیە لە دەو رانی حوکمرانی هیلاکۆخانـدا ، چیّ کراوە وەك لە مێژوودەردەکەویّ هیلاکۆخان لە سالّەکانی (٦٦٠) ی کۆچیدا ،لەمەراغە فەرمان رەوایی کردووە، وگۆیا ئەم کۆنە قەلاّیە کە لە سەر چۆمی جەغەتووە. هاوینە هەواری هیلاکۆ بووە و ئەم لەوحەیەش لە بەردەرگای قەلاّکە نەسب بووە،بەلاّم وێدەچی کە ئەم لەوحەیە پیّوەندی بە دەورانێکی زۆر کۆنتر لە هیلاکۆ بیّ وهیچ دوورنیە هی دەو رانەکانی پێش ئیسلام وتەنانەت بەرلە زاینیش بیّ، بەداخەوە ئەم لەوحەیە،نووسراوەی نەبوو، وکاتێك لە سالّەکانی (٥٠) دا واتە پێش راپەڕینی ئیسلامی ئێران،سەدی بۆکانی ساز دەکرا ،ئەم کۆنە قەلاّیە ولەوحە مێژوویی یەکەی وەبەرکانالی ئاو دەکەون ولەبەین چوون وفەوتێند ران، ئێستا تەنیا وێنەیەك لەم لەوحەیە لە دەست دایە کە خودالیّ خۆش بوو،عوسما - نی یووسفی مەشهور بە (عوسمانی حەمە سیسی) گرتبووی. سەبارەت بە ژیان وبە سەرهاتی (ئەحمەد حەلوا ) ی شاعیریش بە داخەوە زانیاری ێکی ئەوتۆمان لە دەست دانییە، تەنیا ئەوەندە دەزانن کە ئەحمەد حەلوا ، خەڵکی گوندی رەحیم خان دەبیّ وهاوینان تری فرۆشی کردووە وتەنانەت نازانین سەوادی هەبووە یانە؟ ئەگەر چی لە بەیتێکی ئەم چەکامەیە دادەبێژی:

**(سەوادم نەبووبە حوکمی کەمال)**

بەلاّم شێعرەکەی زۆرجوان وپاراوە،پیاو وەشك دەخاکە بلێی رەنگە سەوادی هەبووبیّ.

هەروا ، نازانین بە روونی ئەحمەد حەلوا لەچ دەورانێکدا ژیاوە لە بەیتێکی چەکامەکەیدا دەبی !

**( سەنەم خوێندەوە حەوسەدوسی سال)**

واتە ئەم لەوحەی کەڵ وشێر (٧٣٠) پێش ئەوەی ئەوئەم چەکامەیە دانیّ چیّ کراوە، وەك عەرزم کردن هیلاکۆلە سالّی (٦٦٣)ی کۆچی دا لە مەراغەی بووە ،ئەگەر بە وردە حیسابێك (٦٦٣)ی لە (٧٣٠)ی دەرکەین ،دەبیّ ئەحمەد حەلوا (٦٣) سالّ لەمەوبەر واتە لە سالی (١٣٤٢)ی کۆچی ژیابیّ وئەم چەکامەی دانابیّ.

با ئەوەش بلێم ،ئەحمەد حەلوا ،جگە لەم چەکامەیە قەسیدەیێکی تریشی هەیە بە ناوی ( میرزام قەلای خاو ) بەلام ،دەربارەی تێکستی ئەم کەڵ وشێرە دەبێ بێژم دووتێکستی ئەم چەکامەیەم لە لابوو کە یەکیان خودالێ خۆش بوو ( مام سولتان شامەحمەدی) لە هاوینی ساڵی ١٣٥٢ دا کوتبووی ولە سەرنەوار زەبت کرابوو ،ئەم تێکستەم لە بەهاری ساڵی ( ١٣٥٧ ) دانارده خزمەت کاك قادری فەتاحی قازی وئەویش لە گەل تێکستێکی خۆیی پێکەوە لە کۆڤاری زانستگەی تەورێز ،ژمارەی هاوینی (١٣٥٧) چاپی کردن· ئەم تەختە ونوسخەی دیکەش کە لێرە داپێشکەشتانی دەکەین.لە هاوینی ساڵی (١٣٥۴) دا کاك (حەمەدەمینی زێنێ ) خەڵکی گوندی (جامەرد ) ی بۆکانی کوتوویە ولە سەرنەوار زەبت کراوە ·

### کەڵ وشێر

ئەی پادشای کەریم ،ئەی پادشای کەریم
بە ئیسمت قەسەم، رەحمان ورەحیم
رۆژی دەچوومە سەیری رۆژنامەی قەدیم
کورەی کوهەن ساڵ بە دیدەی خۆم دیم
سەوادم نەبوو بە حوکمی کەمال
سەنەم خوێندەوە حەوسەدوسی سال

* * *

ساڵێکی وابوو،ئەوەل بەهاربوو
دونیا رەنگاورەنگ پاك مێرغوزار بوو
شایی ئیلاکۆ، ئێرەیی شاربوو
کۆشك وپەنجەرەی وێنەی تەلار بوو

* * *

" بە حوکمی ئەڵلاو فەلەکی بەرکۆ"
پادشایی ئیلاکۆ کردی گفت وگۆ
کوتی گەڵێکم هەیە زلی بێکارە
شاری ئیلاکۆیی لە دەست بێ زارە
سبحەینێ زوو بە زوو بەزمی بگرن
لە تەشقی عاسمانان تەیریێ رابگرن
سبحەینی زووئە وکەڵ و شێرە
رووبەروو بکەوێن لێرە ؟

شەو بە سەرداهات قسە قوتاربوو و
سەرلۆتی سەتتاربوو ؟
،سبحەینێ زوو کا لە سەحەری
ئاراستە درامەیدان یەك سەری
لە چریکەی زور ناولە رەنگی دەهۆل
لە مەیدانی دابووبە بۆلە بۆل
ئەوەهاتە دەر عیفریتێکی زل
زنجیرەی لە پاوکوتی هالە مل
دەستی کرد بە سەکۆل، زنجیرە پس پس
کوتەی کرد بە پۆ،پۆیی کرد پس پس
کەڵ نەراندی، شێر کردی سەکۆل
لەو مەیدانە دابووبە بۆڵە بۆڵ
کەڵ بە شێری کوت، بە وری نە ڕەشێر
چابووك وتەرلان دڕندەی دە لێر
کەڵ بە شێری کوت ئەسلەیی جەنگەڵی
ئەتۆ زات دەکەی دێ یە رووی کەڵی
کەڵ بە شێری کوت، بە تۆدەڵێم بە دڵنەوازی ؟
ئەتۆچی وکەڵ چی بۆ بوویی بە هاوبازی ؟
شاری ئیلاکۆ هەتا دیارە
گشتی لە دەست نالەم بێ زارە
چەند مۆرەو بە یاربەستان دڕیدەم
چەندە کەندەلان بە شاخ هەلکەنیدەم
شێرکوتی ،ئەمن شێرێك بووم لە پتری پۆتی
لە قەزوینێ رابۆم دەهات لۆتی
زۆربە چازانی، بە حیلە وفان
دەکەوتە گەردە ئەم دولای کەمان
زۆربە چازانی، بە غەرقەدۆزی
ئەمنیان دەگێڕابۆسە بە بێ ڕۆژی
زۆری پێ نەچوو کەل چووە پەناوە
کۆلانی تەنگی فرەوان دەکراوە
چەندە میروبەگلەر گەڕانەوە دوایە
زۆری پێ نەچوو کەڵ چووە پەنایە
عالەم تێرنەبوون لە تەماشایە
هالەم تەنیشتی، هالە و تەنیشتی
لەوانە بوولیێدەن ، تە پلی بازگەشتی
شێرزامی خۆی داوپەڕی یە سەرپشتی
دەستی گیر کرد لە شەپلکەی شانی

چنگی گیر دەکرد لەشلکەی رانی
کەڵ دەیکوت لەگەل تۆمە ئەی شێری عطی
ئەتوو مەمکوژە من دەچمە حەجی ؟
هەرکارێکت بێ دەیکەم جێ بە جێ
کوتی قەستەم بە وانەی عومەری خەتاب
ئێسکت بودیزە، گۆشتت بۆ کەباب
کەڵ دەیگوت ئەی مالی بەقورگیراوم،چرام کوژاوە
لە دونیایی رەوشەن ، بەشەم براوە
لە یۆنجە خواردن بەشم دیارە، نەماوە

■ ■ ■

زۆری پێ نەچوو کەڵ کردی قەناعەت
رەحمەت لە دای و بابی ئەهلی جەماعەت

■ ■ ■

بالە کۆتایی دا ، بلێم کە تەخت وتێکستەکەی
خودالێ خۆش بوو(مام سوڵتانی شامەحمەد )ی
لەم تەختە تەواوتر وباشترە ولەوداوەکوتری
کە ئەم چەکامەیە(ئەحمەد حەلوا ) داینا وە :
ئافەرین ئەحمەد حەکاکی دانا
نەمدیوە وەك تۆجاهیل وزانا

........................................
........................................
ئافەرین ئەحمەد لە گەل کەمالت
خودا بەرەکەت بدابە مالت

بۆ بەراووکاری لێرەدا دەقی ئەو بەیتی کەل و شێرەش کە لە لایەن کاك رەحمانی میسباح بۆمان ناردراوە بلاو دەکەینەوە .

# کەل و شێر

"رەحمان میسباح"

پاشای عەدالەت ، قایمەلمەقیم
بە ئیسمت قەسەم،رەحمان ورەحیم

■ ■

ئەورۆ هاتمە سەر رۆژنامەی قەدیم
سەدەی کۆهەن سال بە دیدەی خۆم دیم

■ ■

سەوادم نەبوو ، بە حوکمی کەمال
سەدەم خوێندەوە،حەوسەت وسی سال

■ ■

لەتۆ دەپرسم ئەی شای جانەوەر
لێت سوئاڵ دەکەم من باس وخەبەر

■ ■

لە تۆ دەپرسم شێری جەنگەڵی
ئەتۆچلۆن بووی،ئامبازی کەڵی

■ ■

بە بازوو بردت بەو خۆپلەنگەوە
ئەتۆچ دەکەی بە رووی سەنگەوە ؟

■ ■

واتەمش ئەی شەنوعەرا :
ئەمن شێرێك بووم لە جەنگەڵێ را

■ ■

حەوت لوتی هاتبوون لەپەتری پۆتێ
حەوت لۆتی هاتبوون لەقەزبێنی را:

■ ■

بەتەگبیرورا بە حیلە و بە فەند
لەملمیان دەخست ، دوو لایی کەمەند

■ ■

بە تەگبیرو را بە غەرقە دزی
ئەمنیان دەگێرا ، سەبەب بۆرۆزی

■ ■

ساڵێکی وابوو ، ئەوەڵ بەهاربوو
دنیا سەوزەپۆش ،مێرگ وغوزاربوو

■ ■

هاتین بۆ ئێرە ، ئێرە گاشاربوو
"شاری عەلاکۆ" هەتادیار بوو

■ ■

ئەمان ئەمجێیەلێرە، قەلا بوو
کۆشك وپەنجەرەی هەموو ،تەلا بوو

■ ■

رووی شانشینی لە خۆرهەلات بوو
خانم و خاتوونان رێك لێی دیاربوو

■ ■

گەورەی چاوەشان بەبێ ئەندێشە
زنجیر لە گەردن ئەمنی راکێشا
خێشکی کردم بۆ دەرکی پادشا
لۆتیان دەگەڵ پادشای عەلاکۆ
تووشی یەك دەبوون ،کەوتنە
گفت وگۆ

■ ■

شا ، کردی گفتار ئەی لۆتی باشی
کامەتان فێری سیحرو مەکرن ؟

■ ■

ئەورۆدرەنگە،سبحەینێ زووبەزوو
بەزمێ بگرن

لەتەشقی عاسمان،تەیران را بگرن

* *

شاکردی گفتار ، ئەی لۆتی باشی
وەختی نەماوە،رۆژ زۆر درەنگە

* *

ئەمە کەڵێکی زلی بێکارە
عالەمی ئەوشارەی لە چنگ بێزارە

* *

سبحەینێ زوو زوو ئەوکەڵ وشێرە
خۆت بزرەکە ، دەکەین رووبەروو

* *

ئەگەر کۆتابوو ئەوقسەوخەبەر

* *

لۆتی وای زانی گەڕابۆ دواوە
دەست لە بانی دەست ئەستۆی بەلاوە
شەو بەتاری کرد سەری خۆی ناوە

* *

سبحەینێ زوو زووکەللەی سەحەری
مەیدان رابەسترا ،مەیدان یەکسەری

* *

هێنایانە دەر عیفریتێکی زل
کاریتێك لە لاق ،زنجیرێك لەمل

* *

سبحەینێ زوو بوو ،کەللەی سەحەری
مەیدان رابەسترا ،مەیدان یەکسەری

* *

ئەلیاس و سێمان قوباد و ناسر
زوڕنایان لێ دایەك لەیەك چاتر

* *

هەرشێر نەڕاندی ،کەڵ کردی سەکۆڵ
سەنگی کردبەتۆز ،تۆزی کرد بەخۆڵ

* *

لەمەیدانێ دابوو بەبۆڵە بۆڵ
بەچوارلییان دا لەزوڕناو دەهۆڵ

* *

واتەش ئەی شوعەرا :

* *

ئەمن کەڵێکم لە مەیدانی را :

* *

چەن بووره وبەیار بەشان بوڕیدەم
چەن کێوولەندان بەشاخ ( دەڕیدەم )

* *

کەخودابم داتێ یەقبالێك بە جان
شاخێك دەهاوم دەتبەمە عاسمان
وەسێتی خۆت بکە لەکن لۆتیەکان

* *

واتە ئەی شوعرا :

* *

ئەگەر کەڵ وای گوت :

* *

من وا بووم حاڵی
ئەودنیای گەورە پێم دەبووخاڵی
ئەوەی چاوەش دەی دا لێم دەبووتاڵی

* *

هاوارێکم کرد یا پادشای یەزدان
ساحێبی بە حروبەریە وعاسمان

* *

نەبەستی دەستمان
یا ئیمام عەلی بدەی قەوەتمان
ئیمامی عومەر بدەی فرسەتمان

* *

هەرچەندم کردی پشتێ نەدامی
بۆ سەیری مەخلووق ، بوسەیری
عامێ
هاتم لێی بدەم تەپڵی بازگشتی
کەخۆم فڕێ دا ،چوومە سەرپشتی

* *

لاقم پێوەنا بەرەفیچکانی
بەدەستیش دەم گرت ،جووت دەفەی
شانی

* *

ئەگەر واکێشام رام گرت لە دواوە
عالەم تەماشای کرت هەرکەس لەلاوە

* *

هاوار ،هاواربوولێم دەپاڕاوە !
لە دنیای رۆشن ، چرام کووژاوە
لەوێنجە خواردن ،بەشم بڕاوە
لەکن خودای خۆم رۆژم تەواوە

* *

سەدئامان لە تۆ ئەی شای جانەوەر

* *

کاری تۆبەمن دەبێ جێ بەجێ
ئەگەرعافووم کەی دەت بەم بۆحەجێ

* *

لەمەرم نەڕاند ،کەڵێ ناحەساب
شانت دەشکێنم بەتەوری قەساب
جگەرت دەدەم لەشیشی کەباب

* *

واتەش ئەی برادەر :

* *

ئەگەر کەڵم کردەوت و فەزایە
عالەم بڵاوەی کرد لەتەماشایە
ئافەرین ئەحمەد گوێت لەدەنگم بێ
دەگەڵ جەماتێ ،قەبرت رووناك بێ
دەگەڵ گوێد یێران هەرروحت شادبێ

* *

ئافەرین ئەحمەد حەکاکی دانا
شوعرام وانە دی وەك تۆچازانە
مەسکەن ومالی لە رەحیم خانە
ئەمما شاگردی ئەورۆ "سوڵتانە "

* *

دنیا هیچ و پووچ دنیا هەروایە
کەلامی ئەحمەد هەروەك هەڵوایە
بۆکوللی شایەر هەرمامۆستایە .

* *

● لەزبان سوڵتان شایەر،
دانیشتووی گوندی گوێچکەلیم
بیستووە ونووسیومەتەوە.رەحمان
سوڵتان لەگوێچکەلی دەژیا
دەو چەند سالانەی دوایی دا هاتە
سابلاغ ولەوێ مرد .

**پاشماوەی گوتاری مەزهەبی**

٩- نابێ ژیانی جیهان ودنیا کاری تێ بکا ولەوتن وکردن و نووسین و٠ هتد، درۆودەلەسە وخەڵکی فریوبدا، یابەواتایەکی پرتر بۆمیژوو وناوی دنیا هەوڵ بدا، دەبێ خوا ورەزاکەی هەمیشە بخاتە پێش چاو، هەروەك خوا لە سوورەتی "لقمان ئایەتی٣٣"دا دەفەرموێ:

**فلا تعزنكم الحيواة الدنيا، ولايعزنكم بالله العزور٠**

زۆرخاڵی تر هەیە کە بەداخەوە بە هۆی درێژبوونەوەی باسەکەم ناتوانم هەمووی باس بکەم بەلام بەکورتی وبە کوردی دەڵێم ئەوەی لەسەرشانی موسڵمانێکە کەوتۆتە سەر شانی هەموو نووسەرێکیش٠

بەڵێ دەزگاکانی راگەیاندنیش دەبێ هەر ئەو خالانە رەچاوخەن٠ چونکە مرۆڤ ئەو دەزگایانە دەبا بە رێگاوە (چ بینراو،چ بیستراو، چ خوێنراوە) کەوابێ ئایا ئەگەر مرۆڤ بچێتە ژێرباری رەزای خوا وخزمەت بە مرۆف ومرۆڤایەتی یەوە لەبەر رەزای خوا هیچ مرۆڤێك سەرلێ شێواو وگومرادەبێ؟!

ئایا ئەگەر بەم شێوەئیسلامی یە هەڵس وکەوت کرابا، ئەم بیرو باوەرە ماڵ وێرانکەرانە دەهاتنە کایەوە؟

ئایا ئەدەبی بەتاڵی خاڵی و خەولێخەری مرۆڤایەتی دەهاتە کایەوە؟

هەزاران پرسیاری ترلە بوارەکانی تری مرۆڤایەتی داهەن کە پێویست ناکا لێرەدا باس بکرێ ٠٠٠٠٠٠٠٠

**پاشماوەی رازی بەختەوەری**

● ٢ ـ هەمیشە نا رازی بوونی خۆت لەوچێشتانە دەربرە کەخێزانت لێیان دەنێ وخواردنی مالانی دیکەت پێ خۆشتربێ!

● ٣ ـ گوێ بەقسەی ژنەکەت مەدە و بەپێچەوانەی ئارەزووی ئەوەوە رەفتاربکە!

● ٤ ـ لەجوانی ژنانی دیکە بدوێ و خێزانی خۆت پێ ناشیرین بێ!

● ٥ ـ گەشت و گوزار و گەڕان لە بیرمەکە٠ بەلام هەمیشە بەبێ ژن و منداڵەکەت بچۆ!

● ٦ ـ کاتێك ژنەکەت نەخۆش دەکەوێ لەجیاتی ئەحوالپرسی سەرزەنشی ولۆمەی بکە!

● ٧ ـ ئەگەر ژنەکەت کوڕی نابێ وهەرکچی دەبێ تاوانبار وسەرکۆنەی بکە!

● ٨ ـ بەبچوکترین بەهانە توڕە بە وهەراهەرا بخەناومالْ!

بێ گومان خوێنەری خۆشەویست زانیتان ئەم پێشنیارانەمان تەنیا بە مەبەستی شۆخی بوو٠ئینسانێك کەخاوەنی عەقڵێکی کامل و رەوشتێکی بەرزبێ هیچ کاتێك بەلای ئەم جۆرە کرداروئاکارەناحەزانەدا ناچێ ٠ و ئەوەی لەسەر ئێوەژنان و مێردانی لاو پێویستە ئەوەیە کە دروست بەپێچەوانەی ئەمانەوە رەفتاربکەن ٠ و هەرسەرکەوتووبن٠

**پاشماوەی هەژارەکان ٠٠٠**

**هەموو هەژارن٠ زۆریان هیچیان نیە بیخۆن٠ من حازرم بەخێویان بکەم٠ بەلام خۆیشمان پێنج منداڵمان هەیە٠٠ ئەدی چ**

**بکەین؟"**

کابرای ماسی گرکە غەم دایگر - تبوو کلاوەتەڕەکەی خستەکۆشەیەك و دیسان لەبەر خۆیەوەگوتی:

**"نا،بیرکردنەوەی ناوی،خومان پینج منداڵمان هەیە٠ ئەوانیش دوانن٠ دەبنە حەوت٠ ناشی ئیمە بیلین کە ئەم مندا لانەوەکووتووتك لەبەین بچن٠ چونئێمە ئینسانین "٠ ئینسانین"٠** ئینجادەنگی هەڵێنا و کوتی:

**"ژانی راکە بیانهینە بوئیرە حەتمەن ئیستازور دەترسین دایکیان لەکاتی مەرگدابیری لەوەکردوتەوە کەئیمە نایطین منداڵەکانی تەنیا بن٠**

**من بە خیویان دەکەم!بەلکوو خوداش بەوبونەوە نیچیری زورترم بداتی٠ ئەوانیش گەورە دەبن و یارمەتیمان دەکەن"** ٠ژانی،کەلەبەر دەم جیگاکە هەلترووشکابووو فرمیسکی شادی بەچاویا دەهاتە خوارەوە، پەتووەکەی لەسەریان لادا وکوتی:

**"ئەوەتان،ئەوان دەمیکەمیطیرمن"٠**



# تەوری زێڕین

-"وەرگێڕ: ڕێباز بابان"

هەبوونەبوو رۆژێ رۆژگارێ منداڵێکی بچووک ناوی(لی ئەکسیاسۆ) بوو، لە پێنجساڵیدا دایک و باوکی مردن و(لی) هەتیو مایەوە و رۆیشت بۆلای برا و براژنەکەی بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەواندا بژی، لی تەواوی ئەو کارانەی ئەنجام دەدا کە بۆئەوسەخت ولەتوانابەدەر بوون ئاوی لەبیر هەڵدەهێنجا ،داری کۆ دەکردەوە ، برنجی بە دەستهاڕدەهاڕی ، بەڵێ تەواوی ئەو کارە سەختانەی بە تەنها ئەنجام دەدا کە بۆ ئەو زۆر دژوار بوون .

رۆژێکیان لی چوو بۆ دار کۆکردنەوە لە دارستان بۆ کەڕانەوەشی دەبوایە بەسەر ئەولقە درەختەدا بپەڕێتەوە کە کرابوو بە پرد لە نێوان دارستان و ماڵەوەدا ، لە کاتی پەڕینەوەدا بوو تەورەکەی لە دەست کەوتە چۆمەکەی ژێریەوە، لەبەر ئەوەی ئاوی چۆمەکە خوڕبوو نەیتوانی تەورەکەی وەدەستبهێنێتەوە، فرمێسك لە چاویا قەتیس ماوبە کوڵەوە دەستی کردبە گریان لە ناکاودا پیرە مێردێکی مێهرەبان بە ریشێکی سپی یەوە وەدەرکەوت وپرسی، کوڕم بۆچی لێرە دانیشتوویت ودەگریت ،لی لە کاتێکدا فرمێسك لە چاویا پەنگی خواردبۆوە بەسەر هاتەکەی بۆ گێڕایەوە ، پیرەمێرد کە ئەوەی بیست بەسەردا خۆی هەڵدایە ئاوەکەوە،زۆربە خێرایی ولەماوەیەکی کەمدا بە تەورێکی (زێوی یەوە) وەسەر ئاوکەوت و پرسیاری لە لی کرد ئایا ئەمە تەوری تۆیەلی سەری باداو گوتی نەخێر خۆی نیە ،پیرەمێرد دووبارە خۆی هەڵدایە ئاوەکەوە ، ئەمجارەیان بە تەورێکی زێڕین ، وەسەرئاوکەوتەوە وگوتی هەرچۆنێك بێ ئەمەیان هی تۆیە وا نیە؟ بەڵام لی ئەمجارەش سەری باداو گوتی نەخێر ، پیرەمێرد مەلەوانێکی شارەزابوو بۆسێهەم کەرەت خۆی هەڵدایە چۆمە قووڵەکەوە پاش نەختێك لە ئاوەکە هاتە دەرەوە و تەورێکی سادەی ئاسنی بە دەستەوە بوو لیٚ بە بینینی تەورەکەی خۆی هاواری کرد بەڵێ خۆیەتی ئەمەیان تەورەکەی منە.لی زۆر دڵخۆش بوو بەوە ی کە تەورەکەی دەستکەوتۆتەوە لەبەر ئەوەی دەیتوانی کاری زیاتری پێ بکا وداری زیاتر ورد بکاوپیرە مێردەکە رووی کردە لی وگوتی تۆکوڕێکی دروست - کارو رازی بەبەشی خۆت ئەوەش بزانە لە تەواو ی ژیانتدا شادوخۆشحاڵ دەبیت ، کاتێ کە لی ملی ڕێگای ماڵەوەی گرتەبەر دنیا تاریك داهاتبوومانگیش لە ئاسماندا ئەدرەوشایەوە.

کاتێ کە لی گەیشتە ماڵەوە براوبراژنەکەی لە لێ یان پرسی بۆ ئەوەندەت پێ چووکە ئێستە



ئەگەڕێیتەوە ، ئەویش لەوەلامدا هەموو ئەورووداوانەی بەسەر خۆی وتەورەکەدا هاتبوو بۆگێڕانەوە کاتێ کە ئەم هەواڵەیان لە لی بیست تووڕە بوون وهاواریان کرد بەسەردا نەفام بۆچی تەورە زێڕینەکەت وەرنەگرت مەگەر نازانی کە نرخی ئەو تەورە لە چاو تەوری سادەوە چەند جیاوازی هەیە، بۆ ڕۆژی دوایی براکەی لی بە تەنهایی بۆدارستانەکە ڕۆیشت بۆ ئەوەی نەخشەکەی خۆی ئەنجام بدات ، کاتێك کە گەیشتە سەر پردەکە تەورە سادەکەی بە دەستی ئەنقەست فڕێ دایە چۆمەکەوەولە دواییدا لە کەناری چۆمەکە دانیشت ودەستی بە گریە ونالین کرد.

کرد و وتی نەخێر ئەوە هی من نیە، پیرەمێرد بۆ جاری دووەم خۆی هەلدایە ئاوەکەوە وپاش ماوەیەکی کەم بە تەورێکی زێڕینەوە گەڕایەوە بۆ لای براکەی لی، براگەورەکەی لی کە چاوی بە تەورەکە کەوت لە خۆشحالیدا دەستەکانی بە یەکدا هێناوبە پەلە وتی بەڵێ ئەمە خۆیەتی ئەمەیە ئەوتەورەی کە ونم کردبوو.

دوای ئەوەی پیاوە پیرەکە ڕۆیشت وئەمیش لە خۆشیدابوو و زۆربە کەیفەوە سەرنجی تەورە زێڕینەکەی ئەدا ،برا چاوچنۆکەکەی لی سەیرێکی دەسکی تەورەکەی کرد نەختێك قوڕولیتەی پێوە بووچۆوە قەراخی چۆمەکەو قاچی شەرواڵەکەی هەڵ



لەوکاتەدا پیرەمێردێك بە ریشێکی سپی ودرێژەوە بەوێدا تێپەڕی وچاوی بە براکەی"لی"کەوت ولێی پرسی چی ڕوویداوە وائەگریت ؟ ئەویش لەوەلامدا دەستی درێژکرد بۆ چۆمەکە وگوتی تەورەکەم کەوتۆتە ئاوەکەوە ، پیرەمێردەکە گوتی نیگەران مەبە هەر ئێستا بۆت دەهێنمەوە ، ئەمەی وت و خۆی هەلدایە چۆمەکەوە دوای ماوەیەك پیرەمێردەکە بەسەرئاو کەوتەوە وتەورێکی زێوی بە دەستەوە بوو برا گەورەکەی " لی " کە تەورەکەی بینی بە دەستی ئیشارەتێکی

کرد بۆئەوەی دەسکەکەی بشوات ،بەلام هەرکە تەورەکە بەر ئاوەکە کەوت بووبە ماسی یەکی ڕەنگ زێڕینی سەر زل، ماسی بە خێرایی لە ئاوەکەدا کەوتە مەلە کردن.ماسی یەکە دوای کەمێك مەلە گەڕایە وە بۆ لای براکەی " لی" وپێی گوت تۆ دەبی کاری ڕاست و ڕاست گۆیی لە برا بچووکەکەتەوە فێر ببی ،براکەورەکەی"لی" کە ئەمەی بینی بەدڵ تەنگی ودەستی خالی یەوە بێ ئەوەی هیچ تەورێکی پێ بێت بەرەومالەوە وەڕێ کەوت وگەڕایەوە .

# لاپەڕەی سپی داهاتوو چاوەڕوانی قەلەمی منالەکانە .

# جەدوەل

تێبینی : لەپڕکردنەوەی ئەم جەدوەلە داهەموو ئوسوولی کوردی بە پێـــی ڕێنووسی هەڵبـــژێردراوی ئەم گووارە ڕەچاو کراوەجگە لەوەی نیشـانـــە ی ( ٧ ) دانەنراوە، واتائەگەر بۆوێنە وشەی ( شڕ ،کۆڵ ،زۆر ، شێر ،و٠٠) ی تێدابێ بەشکڵی ( شر ،کول ،زور ، شیرو ٠٠٠ ) دەنووسرێ ٠



١ ـ ڕۆژنامە نووس و زانای گەورەی کورد لە بنەماڵـەی بەدرخانی ٢ ـ بلێـنـە ـ کەوشی مـــا ڵات ـ نادیـار ـ جەنگەڵ ـ ئاشپـەزخانەی بەدەن ٣ ـ واژەیەکـە نەبـوون نیشـان دەدا ـ شاعیرێکی بە ناوبانگـــی کوردسـتـانی ئێـراق ـ ئامـرازێکی مۆسیقا ٤ کیایەکی ڕەنگی یـە ـ ئاگاداری لـە ما ڵات ٥ ـ حازر ـ نـــاوی کۆڤـا رێك و بایەکی نەرم ونیان ـ جاران کاری وانێـــت باری دەکرد ٦ ـ تۆ بە ئینگلیزی ـ زیندەوەرێکـــــی خـوێـن مژ ٧ ـ دژی قورس و گران ـ کوڵێکە ـ هـەتـــا زۆرت هەبێ باشتر تێدەکـەی ٨ ـ پووڵی ئێران ـ ناوی کیایـەکە ـ ئاوە لناوی سێهـەم کەسی تـــاك بـــە ئینگلیـزی ٩ ـ ناوی شاعیرێکی گەورەی کورد ـ توانج و تانووت ـ نێوێکی عەرەبی و ئیسلامی ١٠ ـ نـەرم و ئارام ـ تاوێـرە بەرد ـ بەشی وردی پەین و پـــــاڵ ١١ ـ هی کەس مەکێشە ـ جێگەی لە دایکبـــوونـــی نیمایـووشیج ـ ماڵ بێ ئەو نابێ ١٢ ـ زرێبارێکـــی کوردستانی تورکیا ـ ژمارەیەکە ـ گەورەترین بەرهەمی فـەرهەنگی ١٤ ـ ئاواش هەر مانای ڕشتن دەدا ـ وردە وردە بۆ خـەوتـن دێتـەوە گۆڕێ ١٥ ـ ئۆقرە ـ کۆمـەك و دەستگرتـن ـ کیایـەکی کوێستانی یـە ٠



بەرندەی جەدوەلی ژمارە ٤٧

کاك کەماڵ کۆکەیی لەمەهاباد

١ ـ ناوچەیەك لە ئوستانی کوردستـــان ـ گیانـدارێکی کەوڵ بە قیمەتە ـ ٢ ـ بارینی بە تەوژمـی بەفر ـ پشـوو ـ دەنگی ئاوهەڵدێر ٣ ـ شتێك کە کـاری چنینی لە سەر کرابێ ـ شەربەتی ئاولیمۆ ٤ ـ فلـزێکـە ـ ئەوە بـە زاراوەی کرماشانی ـ بە کوردەکانی شیمـــاڵ دەڵێن ـ ئامرازی مەنفـی ٥ ـ مەشقی ئەسپ غاردان ـ بۆ مەنفی کردن بەکار دەکرێ ـ دووپاتی پیتێك ٦ ـ لـــەو لاوە ژمارەیەکە ـ نیشتیمان ـ ئاوی کەرەکە ٧ ـ دانەوێڵەیەک سفاڵ و شتی سوورەوە کراو وەك دیزەو کۆزە ـ بۆ بـانـــگ کردن دەکوترێ ٨ ـ جێگرتوو ، دامەزراو ـ کـولێکـــە ـ عەسڵ نیـە ٩ ـ ئەم جۆرە کەسانە زوو فریو دەدرێـــن ـ تاقـەت و توانایی ١٠ ـ کانگەی ئەوین و خۆشەویستـی ـ لەو لاوە دەبێتە بنۆس ـ ڕوخسار ـ واژە ١١ ـ ڕێ ـ نوێنەری جوانی و بۆن خۆشی ـ بەتاڵ کردنی شتـی ئاوەکی ١٢ ـ هەم خشڵێکە و هەم دەنگێکـە ـ دژی درشت ـ پیاوی دەروون پاك و خودایی ١٣ ـ خەزێنەی ئاوی حـەمام ـ دەستـەنگـــی و نەداری ١٤ ـ پاڕانـەوە ـ بەشی بەردینی چیا ـ دووپاتی پیتێك ـ دەنگدانی پشیلـە ١٥ ـ هاولاوی ، کەسێك کە خروێکـەی گرتبێ ـ شایان و شایستـە ـ هەوسـاری ئەسـپ و چارەوێ ٠



!؟٠٠٠

# بەیتا دەدم (١)

دیاری: خالد سائح.



**گەلی خەلکێ عالەمینە**
**گوهێ خۆ بدەنە حکایەتا خانێ لەپ زێرینە**

**خانەك رابوو ژ هزار جۆتی**
**کرت و مالێ خۆ فرۆتی**
**قەستا شاهێ عەجەم کری ب دلێ سۆتی**

**خانێ کوردا وێ رابی یە**
**هزار جۆتی خویندار بی یە**
**شەڤ و ناڤ دایی رەڤی یە**
**قەستا عەجەمی کری یە**
**نك شاهێ عەجەم روینشتی یە**

دبێژن ل وەختێ خانۆ ل وەلاتێ خۆ خویندار بووی ، هندی ل ناڤ عەشیرەتا گەریا کەسەکی نەحەواند ، ئینا قەستا عەجەمی کر و چوو نك شاهێ عەجەما ، شاهی گۆتێ : تە خێرە ؟ خانوی گۆتی :

ئەزێ ل وەلاتێ خۆ خویندار بوویم و هندی ئەز ل نك سەرۆکێت عەشیرەتایێ گەریایم ، کەسەکی ئەز . نەحەواندیمە ، ئەز یێ هاتیمە ڤێرە ، من قەستا خودێ و تەیا کری ، شاهی گۆتێ :

هندی ئەزێ ساخم ، تویێ شاخی ، ئەز ناهێلم ج بایێت سار ب سەرتەڤە بێن و روینە خار .

هەیامەك پێڤە چوو ... شاهی گۆتە خانۆی :

ئەز حەز دکەم تو دەست ب هاڤێژیە شۆلەکی و بخۆ کارەکی ببینی .

خانۆی گۆتێ : من ج دەرامەتێ وەسا نینە ،ئەز تجارەتەکی یان بازارەکی بکەم ، ئەگەر تو حەز دکەی ئەز دێ چمە بەر بزنی و کورێ من یێ مەزنتر خان عەبدال بلا بچیتە بەر گارانێ و کورێ دی تەتەر خان یێ بچویکە ، بلا ل مال روینتە خار .

شاهی گۆتێ : خانۆ ... ئەم حەز دکەین ، بەلێ ئەم تە ژ هەژی رێنجبەریێ نابینین ، تو مرۆڤەکی گەلەکی بەرکەتی و عاقلێ من گەلەکی ژ تە برِی .

شاهی جا با خەلیفەی ڤرێکر ، خەلیفە وەزیرێ وی بوو ، قەولێ خانۆی و خان عەبدالی بێش کرن و خانۆ چوو بەر بزنێ وی و کورێ وی چوو بەر گارانێ ... حەتا حەفت سالێت وی تمام بوین .

پشتی حەفت سال تمام بوین ، دبێژن رۆژەکی وەسا چێ بوو گۆلکا خەلیفەی بەرزە بوو ، پرسیارا خان عەبدال بەگێ کر کا ج ل گۆلکێ هاتی یە ؟ خان عەبدال بەگێ ژی گۆتێ نزا من نەدیتی یە و ل بەر چاڤێت من نەکەفتی یە ، یا بەرزە بووی . خەلیفەی ژی شەقەك لێدا و خەبەر گۆتنێ،وەختێ هوین رێنجبەر یا عالەمێ دکەن ، ما خەلك وەسا رێنجبەر یا خەلکێ دکەت ؟

خان عەبدال بەگ گەلەك عاجز بوو ،چوونك بابێ خوە گۆتێ :

ئەز ناچمە بەر گارانێ ، بابێ وی گۆتێ : تو بۆ ناچی کورێ من ؟

گۆت : باب ... خەلیفەی زللە هەکادانایە من . بابێ وی گۆت :

بابۆ ... ئەز ژی ناچمە بەر بزنێ وی ...مادەم ئەم دسەر هند عەشیرەتارا هاتین و خەلکێ ل ڤێرێ ژی ئەم داینە بەر زللەها ، ئەز دێ چمە نك شاهی بلا قەولێت مە بێش کەت . ئەم دێ بەتال کەین و ڤێ رینجبەریێ ناکەین :

**ج شەڤەکە خودێ دایی**
**ج رۆژەکە خودێ دایی**
**خانێ رابوو چوو نك شاهی**
**خانێ رابوو چوو نك شاهی**
**تو لەز بکە و بلەزینە**
**مەزن و سەرۆکا بجەمینە**
**تو ڤان قەولا بۆ مە بستینە**
**تو ڤان قەولا بۆ مە بستینە**

ئەم ناکەین و شڤانی یە
ئەم ناکەین و گاڤانی یە
ڕێنجبەری یا عەجەمی یە

هەرێ خانۆ تو وەکە
تو ڤان قەولا بەتال نەکە
دلێ من و خۆ ژێک نەکە

هەرێ شاهی هەرێ شاهی
تو لەز بکە بلەزینە
مەزن و سەرۆکا بجەمینە
تو ڤان قەولا بۆ مە بستینە
تو ڤان قەولا بۆ مە بستینە

ئەم ناکەین و شڤانی یە
ئەم ناکەین و گاڤانی یە
ڕێنجبەری یا عەجەمی یە

هندی شاهی ماپێڤە و گۆتی : تو بۆدێ بەتال کەی ؟ خانۆی ژ خۆ نەگرت بێژیتێ کو خەلیفەی زللە هەکا دخان عەبدال بەگێ وەراندی و گۆتی :

شاهی ••• ئەڤە حەفت سالە ئەم ڤێ ڕێنجبەریێ دکەین ئەم هند دشێین ڕێنجبەریێ دکەین •

شاهی جا با خەلیفەی ڤرێکر و حەقێ وان بێش کر و گۆتە خانۆی : باشە خانۆ تو ژ ڕێنجبەریێ کەتی ، تو دێ چ شۆل بخۆ بینی ؟



خانۆی گۆتی : ئەگەر یاب کەیفا تەبیت ئەز دێ بمە خولامێ بن خیبەتا تە ، ئەمەسرەفەك دا ما لا من ما لا تە ئاڤا و تە نەدازی ما لا تە ئاڤا •

شاهی گۆتێ : خانۆ ••• ب خودێ تو مرۆڤەکی گەلەکی ئەمینی ، تو ل بن خیبەتێ بە ، مەسرەفێ ما لا تە هەمی گەهشتە من و خانۆ مال وێرێ •

هیامەك پێڤە چوو ، دبێژن ڕۆژەکی دوو دەروێش ژ مەوقعەکی ( جهەکی ) عەجەما هاتنە بن خیبەتێ ، شاهی پرسیارا وان کر کا چ هەیە چ نینە ؟

دەروێشا گۆت : وللا گەلەکا خۆشە ، بەس شێرەکی دناڤ بێشەکی دا ئاسێ بووی ، کەس نەوێریت دوێری را بێت و بچیت ، ئەم بێت هاتینە ڤێرە ، مەقەستا تە یا کری ، مە گۆت ئەڤە شاهە ، هەکە ئەو تشتەکی عیلاجەکی لێ نەکەت ، کەس نەشێت چ لێ بکەت •

شاهی بەرێ خودا دیوانێ ، عاقلێ وی ژ کەسەکی نەبڕی ژ خانۆی پێڤە و گۆتی :

تە گولێ هەیە خانێ کوردا، چ دبێژیت ؟

گۆت : بەلێ

ئەوی د دلێ خودا گوت: هەکە ئەڤ مرۆڤە ل دیڤ ئەمینیا خۆ ، مێرینیا خۆ وەسان بیێ مێرخاس بیت • ئەڤ مرۆڤە ب لەپ کەسی ناکەڤیت و گۆتە خانۆی هەڕە عەسکەری ڕاکە ، بەلکی عیلاجەکی ل وی شێری دکەن ••• شاه دبێژیت :



هەرێ خانە و هەرێ خانە
دهلۆ راکە عەسکەرانە
هەرە شێرێ ناڤ بێشانە

خانێ کوردا وێ رابی یە
چەك و سیلاح هەلگرتی یە
عەبدال بەگێ دابوو دی یە
قەستا ناڤ بیشێ کری یە
شێرێ ل نێڕیایی دابی یە
( دەستێ خۆ ب مەتال ڤە )
دەڤێ شێری راکری یە
دەستێ وی یێ کراندی یە
دەستێ دی گوه لێ گرتی یە
یێ ب تورکی ل شێری خوری یە
عەبدال بەگ لێ سویار بی یە
بۆ شاهی بر دیاری یە
چاڤێ شاهی ڤێ کەتی یە
تژی تیمانی کری یە
بکوژن حەیوانێ کیڤی یە

شاهی گۆت : خانێ مال خراب ، تە ئەڤ دەهبە ئینا پێش چاڤێت من ، تە دلێ من قەتاند ، دەربێخن ژ سەرایی و بکوژن •

شێر برە ژ دەرڤە و شیرەك داستوی و کوشت• دەستێ خۆ گرێدا و هاتە دسەرایێ ڤە ، چاڤێ شاهی ڤێ کەت و گۆتی :

خان ئەو چ ل دەستێ تەهاتی یە ؟ تە بۆ گرێدایە ؟

خانی گۆت : دەستێ مە کەلەمەکی ڤێ کەتی ، یێ بریندار بووی من یێ گرێدای • ئێکی ژی گوت :

شاهی ••• وەختێ خان چوویە شێری ، شێری دەستێ وی ب مەتال ڤەیێ کراندی ، چ دەست بۆ نەهێلایە •

شاهی گۆتێ : خانۆ کا وەرە هێڤە •

خانۆ چوو نك ڤە ••• بەرێ خۆدایێ ، دەستێ وی حەتا ئەنیشکێ یێ کراندی ، چ دەست بۆ نەهێلایە ، ئینا گۆتێ :

حەیف و مخابن خانۆ تو ئەڤ مێر خاسە ، ئەڤ زەلامێ هۆیی بەرکەتی ، مایە ب دەستەکی • هلۆ دابچینە نك زێڕنگری ، بلا دەستەکی زێڕی بۆتە بدانیت زێڕ و مفرەق سەر حسابا من ، رح ژی یا ب دەستێ خودێ یە ، هەکە دایی باشە و هەکە نەدایی ، چ ژ من ناهێت •

برەنك زێڕنگری ، دەستەکی زێڕی بۆ لێدانا ، عەزاو نینۆکێت وی هەمی ددرست ، دەستێ وی گرێدا ، وی ژی تشتەك بخۆ کرە سەدەقە • وێ شەڤێ نڤست ، سپێدی رابووڤە •• دبێژن ( رب العالمین ) رحا دایێ ، تشتەك وەسایێ تازە نینە ، ژنویکا ناڤێ وی کرنە :

خانێ لەپ زێڕین •

حەتا ڤێگاڤێ شاهی چەند ئیحتبار ددا سەر خانۆی و چەند قەدرێ وی دگرت و چەند خاترا وی دگرت و مەسرەف لێ دکر • دوو جارا هند ئیحتبار دا سەر و قەدر و خاترا وی دگرت • هەر خانۆیە و کەسێ دی نە • بێ خانۆی تشتەکی ناکەت •

تێبینی ل سەر ڤێ بەیتێ و ژێدەر :

١ ـ ئەڤ بەیتە ئێکە ژ گرنگترین بەیتا کو ل سەرانسەری کوردستانێ دبەلاڤ و هەر جهەکی ب رەنگەکی دبێژن ، ئەڤەژی ئەو رەنگە یا کو ل دەڤەرا بەهدینان دبەلاڤ و من ئەڤ بەیتە یا ژ دەنگێ ( سەبری سۆری ) وەرگرتی ل بازێڕێ دهۆکێ دژیت ل هەیڤا ١٠ سالا ١٩٨٠ ، ب هاریکاریا برادەر خورشید سپینداری ، لەوما ژ دل سوپاسیا وی دکەم•

* گشت رویدانێن ڤێ چیرۆکێ یێ ل کەلا دمدمی هەودایەن ، ئەو کەلاتا نهۆژی شینوارێن وێ ماین و ئەو کەل ئەڤرۆ دکەڤیتە سەر چیایەکی بلند ل دەستێ راستی ژ رێکا گشتی شنۆ ـ ورمێ •

* ئەڤ بەیتە دەق ب دەق یا هاتیە نڤیسین بێ چ دەست کاری و لڤلڤین ، وەسا یا هاتیە نڤیسین وەکی چەوا گۆتی •

٢ ـ هزار جۆ تی : گوندەکە ل دەڤەرا ئاکرێ ل ناڤ عەشیرەتا هەرکی یا •

٣ ـ عەجەم : ب زمانێ عەرەبی واتە هەر کەسەکێ عەرەب نەبیت و ل ڤێرە مەبەست ژێ شاهە و جماعەتا شاهێ ئیرانێ یە •

«دۆم دکە»

# بەیتێن کوردی

*ئەڤ گوتارە ل شەڤێن شێعر و بەرەڤی یا توورەڤانی یا جڤاتا ئەدەبیە "بانی" داهاتە خاندن.*

● **پەرویز جهانی**

هەروەك ئەم حەموو دزانن کو بەیت لناڤ تۆرو ئەدەبا کوردی، بتایبەت لناڤ تۆرو ئەدەبا گەلێری وفۆلکلۆریکی داخودانێ پلە و پەیسکەك هەرە بەرز و بلندە. لێ ئەم بزانن کانێ بەیتێن کوردی چنە و کەنگێ پەیدابوونە و دانەرێ وان یان یەکمین دانەرێ بەیتان ل کوردستانێ داکێ بوویە وبەیتێن کوردی دبنە چەند شاخان ولناڤ وانداکیشەك شاخ وچق ل هەموویێ بەرفرەتر و پێشتر و گەلەکترە.

بگشتی ئەم دشێن بەیتێن کوردی ل سەرچار پشکان پارڤەبکن، هەلبەت هەریەك ژ ڤان پشکانەژی دبنە چەند چقێددی. ئەو پشکانە بریتینەل: یەك بەیتێن ئەڤینداری یێ وەك بەیتێن: مەم وزین، فەرهاد و شیرین، فەرخ وستی، خەج وزیابەند، شێخێ سەنعانێ و.. هتد...

دوو: بەیتێن ئایینی وەك بەیتێن: حەزرەتێ عەلی وحاتەم، بەرسیسێ عابد، زەمبیل فرۆش هەسپێ رەش، نەوا لا سیسەبانێ و هتد.

سێ: بەیتێن میرانی یێ یان حەماسی وەك بەیتا دمدم.

چار: بەیتێن جڤاکی وکۆمەلا - یەتی، وەك: بەیتاکەوا، بەیتاکەل وشێر، بەیتا پلنگ وهتد.

تاجیهێ کوبۆمەرۆن بوویە بەیتێن ئەڤینی یێ ل دیتر چقێد بەیتان زۆرتر و بەرفرەترن.

پێش وێ هندێ دا کو ئەم بچن سەرچاوا پەیدابوونا بەیتێن کوردی دابئاخڤن پێدڤییە کو رەه وریشا ناڤ وگۆتە وپەیڤا "بەیت" ڤەکۆلن وبزانن کانێ رەه وریشا ڤێ پەیڤێ چاوا و ل کیدەرێ راهاتییە ناڤ زمانێ کوردی، ل چ زمانەکی راهاتییە، گەلۆ کوردی یە یان ل زمانەکی بیهانی راهاتییە ناڤ زمانێ کوردی. هندەك ل تویژکار و لێکۆلەران لسەرێ بیر و باوەرێنە کو پەیڤا "بەیت" ل گۆتەیا "بایاتی" یاتورکی کوجور ە هەلبەستێن چارینەیێن فۆلکلۆریکییە ئەڤیندار یێنە، هاتیە ڤەکرتن. هندەك ژی دبێژن کو "بەیت" ژ هەمان گۆتەیا "بەیت" یا عەرەبی کوبئارش وئانکوویا مالکەك هەلبەستێ یە، هاتییە وەرگرتن.

ئەز ل سەر رایا دوویێ مە. هەیلۆ ل سەروێ رایێمە کو "بایاتی" یاتورکی ژی ل گۆرانکاری یا گۆتەیا "بەیت" یاعەرەبی چێ بوویە. هەرئوسا "بەیات" کوناڤێ چەند مقامێن سازبەندی یافارسی یە وەك بەیات ئیسفهان، بەیات تورك وهتد، ئەوژی هەرل بەیت یاعەرەبی هاتییە وەرگرتن. چونکی زمانێ عەرەبی پاشی سەرکەتنادینێ پیرۆزە ئیسلامێ ل سەرهەموو زمانێن رۆژهەلاتاناڤیندا، بتایبەت ل سەر زمانێ بسمولمانانداکار کرییە و پەشکیایەناڤ وان زمانانە، ئەڤە ل سەر ناڤێ بەیتێ بوو. لێ ئەم بزانن کانێ بەیت ل کوردستانێدا کەنگێ وچاوا پەیدابوویە و چاوا گۆرانکاری ل بەیتاندا چێ بوویە. هەرچەندکورۆنکرناڤێ دۆزێ کارەکی هێسان نینە و حەوجەیی ب لێکۆلین وتوێژکارییەك یەکجار کوور ودوور و هوور هەیە، لێ پێدڤییە حەتاجیهێ کوژدەست مەبێ، ئەواکول ڤێ بارێ - دا گۆرەکی سەرپەلگێن هەیی بۆ مە رۆن بوویە پێشکێش کەین:

ئەگەر ئەم قەبوول بکەین کو بەیت یاکوردی ژ "بەیت" یا عەرەبی هاتییە ڤەکرتن، دەبێ ئەم قەبوول بکەن وبپەژرینن کوبەیتێن کوردی پاشی سەرکەتنادینێ ئیسلامێ ل کوردستانێ دا پەیدا بوونە و بدەستێ شاعرێن لێهاتوو وژێهاتی ل سەرشێوەیەك تایبەت هاتنە دارشتن.

ب بیرورایا من و گۆرەکی سەر.

پەلگێن هەیی دناڤ بەیتان داخیم و بونیاتیٚ بەیتا ل ئەدەبا کوردی دا یەکەجاریٚ محەمەد فەقی بیٚ‌طەیران هوٚزانیٚ سەدەیا یازدیٚ مشەختی دانایە٠ پشتی وی بەیت ل کوردستانیٚ دا پەیدابوونە٠هەلبەت دڤیٚ ئەم حسابائستران وبەندوباو و حەیران و لاوژەو لاوکان ل بەیتاجود ا بکن،ئەڤانە گەلەکی کوٚن و مێژینن ٠

ل باراڤیٚ هندیٚ داکو فەقییێ طەیران یەکەمین کەسەکوخیمیٚ بەیتان دانایە،سەرپەلگا هەرەگرنگ وبەر - بچاڤ شوونەوارێن فەقی بخوٚنە ٠ کوٚرەکی لێکوٚلینێد تویٚژکارابوٚمە روٚن وئەشکەرەبوویە کو بەیتێن شێخێ سەنعان ، گەلادمدم،هەسپێ - رەش وچەند بەیتێن دی بیٚ فەقینە ٠ بوٚنموونە ل کوتایا بەیتا دمدم دا ئەڤ بەندا هاتییە :

**"د پاشی ڤان قان را**
**ژنەبی وئەولیان را**
**ژمیم و حیٚ وخان را**
**فاتحە ژ روحیٚ وان را"**

هەروەکی روٚن بوویە میم وحیٚ تەخە - لوسا فەقییێ طەیرانە،خان ژی خانیٚ لەپ زیٚرین خودانیٚ گەلادمدمە ٠ ئەڤە مەزنترین سەرپەلگەیە کو فەقی خودانیٚ ڤیٚ بەیتیٚ یە ، سەرهاتییا شێخیٚ سەنعان ژی کو فەقی ل بەر یا شیخ عەطارێشابووری وەرگرتییە سەرپەلگەیەك دییە ئەمەا ئەم بزانن کانیٚ بەیت چاوالناڤ خەلکیٚ دابەلاو بوویە وچاوائەڤ ئال وگوٚروئەڤ بەلاو ئاشێتاهاتییە سەریٚ بەیتێن کوردی٠ گەلوٚ ئەڤ بەیتانە چیروٚك وسەرهاتییا وان پێشدا ناڤ خەلکیٚ داهەبوونە یان بەیت بێژوشاعران ئەڤ چیروٚك وسەرهاتانە ل دیروٚکیٚ وکوٚمەلیٚ وگەلێن جیران وەهەڤ هێنی وەرگرتنە.

هەروەکی ئەم حەمیوودزانن بەریٚ ل کوردستانیٚ دا خاندنخانە و ناوەندێن فێرکرنیٚ هەرمزگەڤت و حوجرەبوون ودەرس بێژژی هەرمەلا بوون وخاندوان ژی فەقی ٠ دیارەکو فەقی ییٚ حوجرەیەکی ژچەندین ناڤچێن کوردستانیٚ دهاتن و لا ل مەلایەکی دەرس دخاندن٠ دەرسەك ژدەرسان ژی خاندن وفێربوونا شێعرو هەلبەستان بوو ٠فەقی یان شێعر ل مەلایاوەردگرتن ول بەر دکرن ٠پاشی ویٚ هندیٚ کودچوونە ناڤچێد خوٚ ئەو تشتیٚ کوفێرببوون بوٚ جەماعەتیٚ دگوٚتن ودخاندن ، جەماعەتا نەخاندەوار ژی کو تیهنی ییٚ فێربوون وزانینیٚ، هەر ئوسا ئەڤینداریٚ شێعروهەلبەستان بوون، ئەواکو فەقییان ژوان رادگوٚتن لیٚ وەردگرتن ول بەر دکرن، لیٚ چون نەخاندەواربوون ونەدشیان ئەواکو فێربوونە ول بەرکرنە بنڤیسن،ل بەر گێروکرفتێد جوٚر بەجوٚر ئەو تشتێن کو ل بەرکربوون هندەك ل بیرا وان دچوون ئێجا بنەچاری هندەك پەیڤ وگوٚتەل بال خو ل شێعرێن فەقییان کێم وزێدە دکرن وبەرەبەرە بەیت ل سیستما خوٚیە بنێشەیی دووردکەت ودبوو تشتەکی دی٠بوٚ نموونە تەماشا بەیتا شێخیٚ سەنعان بکن کوخودیٚ لیٚ خوٚ شبوو یا مارگرێت روٚدینکوٚییٚ ئەودکە ل ئەسلاویٚ یافەقی چاپ کرییە و دایە بەرهەڤ ٠

بەلیٚ بڤی جوٚرەیی بوو کوپاشی چەند سالان ئال وگوٚرەك ئوساهات سەریٚ بەیتێن کوردی کول هەر ناڤچە ومەنتەقەیەکی کوردستانیٚ دا هەریەکی ئەوبەیتانە بجوٚرەکی و بزاراڤەکی سەردلیٚ خوٚ دگوت و بەیتەك کوردی بچەندین شێوە و جەلەبان چیٚ بوو٠ بوٚنموونەبەیتێن مەم وزین ودمدم٠ ئەم نهەدبینن کوبلی کتێبا مەم وزین ،بەیتا مەمیٚ وزینی ،بەیتا مەمیٚ ئالان ،بەیتا زینیٚ، هەریەك بجوٚروجەلەب و شێوەیەکی ل کوردستانێدا بەلاو بوویە٠ مەمیٚ بەلەنگاز گەه بوویە کوریٚ ئیبراهیم پاشاییٚ یەمەنیٚ، گەه بوویە کوریٚ ئاران پاشا ٠وەکی ل فوٚلکلوٚریٚ داهەیە ودبێژە :

**"مەمیٚ کوریٚ ئاران پاشا**
**بلاگو ل بشەوتە ، تەڤ**
**خاشخاشا"٠**

سووژە هەمان سووژەیەکوشاعریٚ نەمرخانی مەم وزین لەبەرنڤیسی یە لیٚ پەلگ وچق لیٚ کێم وزێدە بوونە ٠ یان بەیتا دمدم، هەروەکی ل سەریٚ مەروٚن کرو مەگوٚت کو فەقییێ طەیران ئەوبەیتادانایە چون هەر وەکی ئەم دزانن گەلادمدم دسالا ۱۰۱۸ ی مشەختی ییٚ هەیڤی دا بدەستیٚ شاعەبباس هەلوٚشیایە ، فەقی ژی هەلبەستاخویە بناڤ و دەنگ "دلوٚرابە" کوبناڤیٚ بەیتا دنیٚ بناڤ وبانگە ل سالا "۱۰۴۱"یٚ مشەختی ییٚ هەیڤی دانڤیسی یە :

**"ل محەمەد هەفت قەلەك چوونە**
**ل هیجرەت دەورگەلەك چوونە**
**هزارو چل ویەك چوونە**
**ئەڤ غەزەل هاتە دیارە"**

یان ل شێعرشێعرانیٚ یانیڤەکا

مه لایێ جزیری وفەقییێ طەیراندا فەقی ل بەندەکی داکو بەرسڤامە لا ددە وەهادبێژە :

**"بریندارێ عێشقێ مە**
**دوورم ژ سیهابیهان**
**زانن مەداحێ کێمە**
**د هەزار ویطێ وسیهان**
**سەناخوانێ "مطنێ" مە**
**ل هەموو عەردوجیهان "**

بڤی جورەیی بۆ مەرۆن دبە کوفەقی هۆزانێ سەردەما کاڤل بووناکە لا دمدمە.بەیتا دمدم ژی گۆرەکی کوتاترین بەنداوێ کو ل سەرێ مەپێشکێش کریا فەقییێ طەیرانە ودقەومەکو فەقی بخو بینەرێ وێ قەومینێ ژی بوو بە. ئەمما ئەم نەبینن کوبەیتا دمدم بچەندین جوۆوجەلەبا ،بچەندین بنزارا ڤەو زاراڤان ل کوردستانێ دابەلاوبوویە. بزارێ کورمانجی یاناڤین ، بزاری کورمانجی ژوۆرین.بتایبەت بڤی زارێ کورمانجی یاژۆرین بوویە چەندین چق وشاخان .بۆنموونە یەك ئەوە کو دڤێ ژماراسروەی دا چاپ و بلاوبوویە (یاکودیاری یا براخالد سالحە) یەك ئەوە کو ماموستا قاناتێ کورد ژ ل ئوورساتێ بەرەڤ کرییە وچاپ بوویە،بلی وان سێ جورە ژی لالی من هەنە :

یەك: بدەنگێ سالۆیێ متۆ خەلکێ بەلەسۆرازێرین,کوزۆرنێزیکی سەرهاتییا مێژوویی یەونا ڤێ زۆر کەسێن راستی تێداهاتنە وبەیتە . یەك بدەنگێ بەکۆیێ بەنگین کو ئەوژی خەلکێ چەکمەزەراثەلمەندێیە ئەوژی بەیتە ولێ د گەل یادی زۆر فەرق وجودایی یاوێ هەیە،یاسێ یێ ژی بدەنگی ئەحمەد کەوشەن خەلکێ ئەلواجێ . ئەڤە بکشتی چیرۆکەك دووردرێژە خودانێ چق و پەلکێدزۆر وبەیت ژی نینە،قەولی- کۆتی دەڤکی یەوبینانی رۆمانەکییە.

ئەڤە پێنج جوۆوجەلەب ل بەیتەکی یەکومن دبتنە .دیارە ئەگەر ئەم لێ بگەڕن ئەمی چەندین جوید دی ژی پەیدا کن . ئەڤایە سەرهاتییا بەیتێن کوردی و گۆرانگای یاکو ل سەروان هاتنە کرن.

لێ ئەم بزانن کانێ بەیت دگەل دیتر ئەدەبێن ڤەهوونائییە فۆلکلۆریکییە کوردی چ جودائی و وەك هەڤی یا وان هەیە. ئەگەر ئەم گشتی بەیتێن کوردی دگەل دیتر تۆرو ئەدەبێن فۆلکلۆریکی هەلسەنگینن ول هەمبەرهەڤدا هلتەقلینن،ئەمێ برۆناهی ببینن کو ئستران ،واویلۆك، لاوك، لاوژە، حەیران، سوارۆ ،لۆ، کەلۆ،پاییزە، (پیرەپاییزۆك ) قەتارە،ئسترانێن گوڤەندو دیلانێ وهتد،هەموو چ ل بارا ناڤەرۆك وثارش ومەعنایێ دا، چ ژی لیاراکێش و قالب وداڕشتنیدا جودائییاوان دگەل بەیتان هەنە و ئەم دشێن بئاسانی بەیتان ل دیتر چقێد ئەدەبیاتا فۆلکلۆریکی ڤەقەتینن،بۆنموونە :

یەك: بەیتێن کوردی شێعرێن کلاسیکن، تەواوی مسرەعێد وان هەڤ برگەنە، مەگەر دەست لێ هاتبن وەردانێ. لێ ئستران و لاوژە ودیتر مەبەستێد ڤەهووثائییە فۆلکلۆریك ل سەرشێوا شێعرێد ئازادن.

دو : پشکا زۆرەبەینان تژینە ل گۆتە وپەیڤێن ئەدەبییە عەرەبی و فارسی ،لێ زمانێ ئستران ولاوژە و حەیرانان خۆمالی وسادەیە وگۆتە و پەیڤێدبلی کوردی تێدادەست ناکەڤن مەگەر جاروبار.

سێ: بەیت سەرهاتییەك بتەو وتەکووزە، چیرۆکەکە کول سەرێ حەتابنی گشتی سەرهاتاوێ پێکڤە گرێدائییە. یان ژی ل سەرمەبەست ودۆزەك تایبەت بدرێژایی دئاخڤە ، لێ ئستران وحەیران وبابەتێن دییە ڤەهوونائییە کوردی دەربڕینا هەست وسۆزادلێ بێژەرە،نەسەرها- تەکی دگێڕە ونەل سەر دۆزومەبەستە- ك تایبەت دئاخڤە، یان بەندەکی داوێژەسەر کوشتییەکی کودیار نینە بۆچی وبدەستێ کێ هاتییە کوشتن، یان ژی ب بەژن وبا لاگراڤی ویارەکی هەل دبێژە،یان ژی ل سەر دووری وئەڤینەکی وتشتەکی ئوسا دئاخڤە.

چار : دانەر وبێژەرێن بەیتان خوندەوارن،ئەڤا ل ناڤەرۆکا بەیتاندا دیارە کو بێژەرودانەرێ وان دگەل ئەدەبیاتا عەرەبی و فارسی ناسیارن،لێ بێژەرێ دیتر چقێد ئەدەبییە ڤەهوونایی،فارسی و عەرەبی نزانن ونەخاندەوارن،هەر ئوسا دگەل ئەدەبیاتابیهانی یاژی ناسیارنینن.

حەیف وموخابن کولێکۆلەر وتوێژکارێن مەبەندوباووئسترا ن ودیتر چقێدئەدەبیاتێ تێکەلی هەڤ کرنە وژپشکازۆرەوانڕا هەر "بەیت " دبێژن. ئەڤ هەلەیە ل زارێ کورما

**بڕوانە لاپەڕەی ٧٢**

# پاله‌تی

## دلبرین شلی

**پاشماوه‌ی بمینین کوردی**

نجی یانیوه‌راست دا زۆر تر بسه‌ر چاڤـا دکه‌ڤه‌وکه‌له‌کتر نشته‌بهیستنی · وان لێکۆله‌رێن مرۆزهه‌رچی ل ئه‌ده‌بیاتا ڤه‌هووناتیه کوردی دادیتنه ، ئوسا زانینه کوبه‌یته · بۆنمونه :

پاییزه ، کمنج خه‌لیل ، ڤزج عوسمان شێخ ره‌ش وشێخ مند ، زه‌ینـــه‌ل و کۆزه‌ل وچه‌ندین ئسترانێ دی رابیت دبێژن، لێ ئه‌ڤانه بمیت نینـــن ·

ئه‌وانا بمندوئسترانن · لێرندا ل هه‌موو وبرایین بریزه تویژکارتکایی دکم کو ل سه‌رڤێ مه‌سئه‌له لاکرنکه زیده‌ســر بخه‌ستن، داکوو ل داهاتییه‌ك نێزیك دا ئه‌ڤ هه‌لمیا مه‌زن ل ناڤ بچـه و به‌ردا ره‌شه ئه‌زانینێ ل سه‌رڤێ جما ئه‌ده‌بیاتا کوردی بێنه‌راکرن وتریشکا تاڤا رۆنه‌رانیێ هه‌موو قوژ وقوژبنێ تاریبه‌ئه‌ده‌بیاتا کدلێ مه‌رۆناهی بکه ·

ب هیڤی یاوی روژی ·

به‌ری رۆژل پشته چیای ده‌رکه‌ڤیت ل گه‌ل بانگێ سپێدێ ، ده‌نگه‌کـــی دهێت گوهێن وی هلۆ هلۆئاڤده‌ل ، درهنگه ماتوناچی شۆلێ ئه‌ڤرۆ ؟

ئه‌ڤ ده‌نگه دگه‌هیشت گوهێــــن وی ،دزانی ده‌نگێ کابانیاوییـه بەلێ هرزدکر ، ڤەونەهیشِ سپیـدە نه‌بییه ، خۆل بن جێ ڤه‌بێ ده‌نگ کر · جاره‌کادی گازی کرێ : - هلۆ · · هلۆ ئاڤده‌ل ئه‌ڤرۆ درهنگه ، وه‌ختـه رۆژ ده‌رکه‌ڤیت ·

ئاڤده‌ل سه‌رێ خۆ بلندکربـــه‌رێ خوێ دایێ ،کودونیایازه‌لال بـــی ، به‌س هندی ماندییه نه‌شێ رابیتـــن چون دوهی چووبوو شۆلێ ،له‌شـــێ وی زۆرێ دئێشیت ، ل بنێ پییـــا تاکو کولاڤینکاسه‌رێ وی، تـــو دبێژی بێ کرییه دجۆنیدا قوتـــا ی وه‌سا یێ هه‌ڕشییه ،به‌س یێ نه‌چـا ر بووبه هه‌چی ره‌نگێ هه‌یی رابووڤـه ل سه‌ر جهێ خۆ، ده‌ستێ خۆداچاڤێن خو ، خه‌واتێنبه‌لیێ لێ ره‌ڤانـدزل و زل ده‌مه‌زلکێ نیری،دیت· کوزارۆکێـن وی نڤستینه وخه‌واشرین دا ، ل سه ر تابه‌ڕکه‌کا ره‌ق ، به‌لێ کوئه‌ـــه ڤ دیمه‌نه دیتی ، رابووسه‌رپێدخۆ،ــێ

چارجارا پشتا خوڤه‌قراند ،ده‌ست و چاڤێن خۆ شوشتن ،ده‌ست نڤێژاخو ه گرت دوورکه‌مت نڤێژبۆخودێ کر ·

گازی کابانیا خۆکر، کاپیاله‌کـا چایێ بۆمن بینه !! به‌رسڤا وی د ا توبخۆ دزانی ئاڤده‌ل ، مه‌شه‌کـــر نه‌مایه ، پاره ژی ل ده‌ستێ مــن د ا نه‌بوون بکرم · ئه‌ڤه‌بیست رۆژه‌ســه ر ده‌هوه‌تا کورێ حه‌جی ڤه‌چوون ،بـــۆ مه‌ژی خه‌لات یێ ئینای، دڤیائــه م ژی بچین سه‌رخۆشیاوی ،ئـه‌ڤــــه عادەتێن دونیاییێ نه ·

له‌گه‌ل ڤێ ئێکی کــورێ وی رابووڤه ل سه‌ر تابه‌ڕکاره‌ڤه یـــێ دکه‌ت گری ، ده‌یکا وی گـــۆتـــێ ته‌چییه کورێ من توڤێ سه‌ره‌سحارێ دکه‌ی گری ·

گۆت دادێ پشتامن دئێشیت ل سه‌رڤێ تابه‌ڕکێ ماکمنگێ بابۆ دێ بۆمن نالیکه‌کی کریت ·

بابێ وی هیڤکرێ کرین دلـێ وی هات ، کوئه‌ڤ ده‌نگه گه‌هشتــــی گوهێن وی ،به‌س چبکه‌ت چ ژده‌ستی ناهیت ، رابوو ده‌ست داچه‌نکـاخـو دابچیت ·

جاره‌کادی کورێ وی گازی کــرێ باب گه‌رتو زڤڕی پێلاڤه‌کێ بۆمــن بینه ،پێلاڤێ من یێ دڕیایی،ئـاڤ دچیت پێ مـن ·

ڤه‌زڤڕی ، گۆت: باشه کورێ من · چه‌ندکاخۆ ب ملێ خۆڤه‌کـــر پشتاخودا مال، به‌ره‌ڤ مه‌یدانـــا پا لاڤه چوو، ب وی دلێ پرخـه‌م و که‌سه‌ر ل ناڤ زارۆکێن خوده‌رکه‌فت ب رێڤه‌ل ئاڤاهیێن ره‌فین جـــادێ دنێڕی ، دگۆت خوئاخ دونیایـــه هنده‌ك یێ ڤه‌هرین سێ چاره‌رتبێ ئاڤاده‌کەن، هنـده‌ك ژی ب تیجارتێ ڤه‌ده‌موژیلـن نزانـن دێ پارێن خوکه ن کێرێ ، هنده‌ك ژی وه‌ك من نزانـــن چاواێ نانه‌کێ بۆزارۆکێن خـــۆ په‌یداکه‌ن ، دوێ هزرێ دابووپیــر ه‌میره‌کێ‌ل ره‌خی‌دی یی چادی ، چاڤـی وی ڤێ که‌فت کوعه‌ره‌بانه‌ك یـا ل پێشیاوی هلکه هلکا ویه تاکوپـــال ده‌ده‌ت ، گرنژی وگۆت هنده‌ك ژ ی هۆسایێ رێنجێ دکێشن تاکونانـــێ خویه‌یدا دکه‌ن ،ل گه‌ل هــــندێ ئوتومبیله‌ك ژمۆدێلێن نوێ خـۆ ش دهات ل گه‌رکه ئاڤێ دا ،پرچکێــن شۆڤاڤێ سه‌رسه‌رێ ئاڤدەلی ڤه‌برن · ده‌ستێ خو داوان چبکا ل شه‌لوالــێ

خوّپاقش کرن ، گوّت هندەك ژ ی هوسا ب مالیّ دونیاییّ بصتران و شەمبوّز دبن,زیکاخو ژبیردکەن خا لاوان وەرمهەرشەو مروّڤن کو چەند پارە هەنە٠

دڤان هزرا دابووتاکوگەهشتە مصیداناپا لادیت پالەکوّم کوّم دراوستاینە هندیّ چەنکیّن خو هەل دگرن ل گەل هندەك کە سادچن شوّلیّ هندەك ژی دموژیلن ب ئاخفتنیّ ڤە ل گەل خودا نیّن شوّلیّ هەڤالەکی وی ل نیڤسا مەیدانیّ هات پیّش یاوی گوّت ئاقدەل‌ئەڤروّ تو درەنگە هاتی!

ئاقدەل گوّت بەلیّ ئەز ئەڤروّ زی نەرابووم ژخەو بەلیّ‌شوّل ییّ چاوانە ئەڤروّ٠

بەرسڤاوی دایەڤە ساعەتەکەئەز لیّرە کەسی نەگوّتیە من وەرەدابچین شوّلیّ بەس وەدیارەکە کەشوّلیّ کیّمە وەرە رینە ئەگەر رزق هات دیّ هیّت، چەنکا خوداناسەرعەردیّ ل رەخیّ مەیدانیّ رینشت ل هیڤیّی کادیّ کەسەك هیّت بیّژی وەرەدا - بچین شوّلیّ یان نە هەڤالیّ وی ژ دلەکی بریندار گوّت کە کوّ تو دبیّژی جارەکیّ ئەم ژی وەکی خەلکیّ نانەکاراحەت بخوین کەسەك نەبیّژیت مە ل خانییّ من دەرکەڤن وەپارە نەداینەڤیّ هەیڤیّ؟؟

ئاقدەل گوّت کە کوّخەمانەخوّ دیّ خوّپیرکەی،باریّ ڤیّ دونیاییّ ل سەر پشتا خوگران نەکەی٠ئەگەر دیّ بن ڤەفەتی ئەڤ دونیایە چو نینە ئەڤروّ بوّریت تاکو سوباهی خودیّ کەریمە، بوّمەژی دیّ هەر دەرگەهەکیّ خیّریّ ڤەبیت ، چون کەسیّ دڤیّت سەربلند بژیت دڤیا هەمی نەخوّشیاراگریتن رەنجیّ بکیّشیتن تاکودەستیّ خول بەر خەلکیّ نەگریت ، هەوجەی نەمەرد ا نەبیت ، پالەتی بوّمەسەرفەرازییە چون ئەم وەك هندە کەسانەبیّت رەنجیّ دکیّشن ، بەلیّ ئەوناخوّن هندەکی دی پیّ قەلەودبن وەکی طاژی بە نیّچیری ڤەمانـدی دبیت تاکودگریت بەس ئەول بەردەرگەی

هیّتکازەترنابینیت بەلیّ کەکیّ منوّ ئەم زەحمەتیّ بەکیّشین ژبوّ زاروّکیّن خوداسوباهی کەسەك نەبیّژیت زاروّکیّن مەبابیّ تەخو لامیّ بابیّ من بوو، داسەربلند بن ناڤ خەلکیّ داوەك دبیّژن نانیّ خوّبخوّ ب ئاڤیّ منەتا خەلکی پاڤی ٠٠٠



## هەڤیریّ دیروّکیّ

### قەچاخ «ئیّراق»

وە دیت چەوا
پیّلا دەریا ستەمکاریێ
گەمیانویّ چەك
تاقیکرنیّ
ژ هیروّشیما و ناکازاکی
بەرەڤ وەلاتیّ مەن
هاژوّت
مەژی بەرو دلئاسنا
ب رەشەراڤا
" جینوسایدیّ "
ب هەمی رەنگیّت
ژەهروکیمیا
گرنژینا جوان و پیرا
شەنگە خەملا ئاخ و چیا
ب تەڕ و هشکڤە
کوزراند و سوّت
دەرگەهڤانیّت
ماف پەرێسیّن مروّڤاتییّ
خوّ بیّ گوهکرو چ نەگوّت
ئەها هینگیّ
پالە و جوّتیار و رێنجبەرا
سەر بوّرەك نویّ
ڤەهاند و دوّت
تا کو ما بت
ئیمپریالی و پاشڤەڕوّیی و
کوّلەداری
تا کو ما بت
تەپەمریانەتەوایەتی و
خوینخاری
تا کو مابت
بوّژوایی و دەرەبەگی
میّتنکاری
درویشمیّ خوراگرتنیّ
دناڤا چاڤارا بمینیت
بزوّت
تیّکەل خوینا پیّنج هەزار
هەلەبچەڤانا
دگەل ئاخا کوردستانیّ
هەڤیرەکی دیروّکیّ یە
هەر و هەر
دیّ خوّیی
ڤەخوّت
هەر و هەر دیّ
خوینیّ
ڤەخوّت ٠

# فەرهەنگۆك

**ئیجابی :** (مثبت ) ،شتێکی کە قازانج و سوودی تێدابێ ،شتێك کە باری باشی هەبێ

**بیانی :** بێگانە ، لاوەکی

**بایەخ :** (ارزش ) ،دیاردە یا هەر شتێك کە بایەخ و کەلکی هەبێ · بە تایبەتی بابەتێك کە بۆ کۆمەڵ و بزووتنەوەی کۆمەلایەتی و سیاسی بە کەلك بێ و جەماوەرهەوڵی پاراستنی بۆ بدا

**بەو پێودانە :** بەو پێوەرە، بەو مەعیارە ، بەو شێوەیە،بە پێی ئەم بۆ چوونە

**بنەگر بوون:** سەقامگیر بوون ، جێگر بوون ، دامەزران

**پێزە :** گەوهەری یەکدانە،برێك لە شتێك

**پەیژە:** پەیجە،پەینجە ، نەردیوان

**پریسك :** پرشكە ،پرپشكی ئاو یا ئاگر

**پلووسك :** لووساوك

**تێوە چوون :** پیر بوون،بە ساڵدا چوون

**تەقتیع :** دابەش کردن ، لەت لەت کردن ،دابەش کردنی شێعر بە پێی وەزنی عەرووزی

**چەتر هەڵدان :** خۆ جوان کردن و خۆ بە خەڵك نیشاندان ، خۆ رازاندنەوە بۆ کۆڕ و مەجلیسی زەماوەند و هەڵپەرکێ

**خڕیلانە :** کورتە بالا و قەڵەو،کورت و ئەستوور

**دەستووری گشتی :** قانوونی ئەساسی ، یاسای گشتی

**دەنگبەرە گشتی‌یەکان :** ( رسانەهای گروهی ) ئەم ئامراز و هۆیانەی هەواڵ و گوتار بۆ کۆمەڵگا بڵاو دەکەنەوە

**دەستە بەر :** (ضامن ) زامن ،کەسێك کەبەڵێنی ئەنجام دانی کارێکی دابێ

**دەستە بەر کردن :** (تضمین)زامن بوون ، پێك هێنان ،دابین کردن

**دیرۆك :** مێژوو،تاریخ

**رسکان:** شین بوون،خۆ گرتن (بۆ شەتڵ و نەمامی تازە نێژراو) ، روان

**سەرەتی :** (امتیاز)جیاوازی ،بایەخداری ،سەرتر بوون لە کەسێك یا شتێکی تر

**سەلبی :** (منفی ) شتێك کە زیان و زەرەری هەبێ ،دژی ئیجابی ، لایەنی خراپ و دژایەتی

**ساڵی مەلا خەلیل :** ساڵی ۱۳۰۷ی هەتاوی کە بۆتە سەرەتای تاریخێکی ناوچەیی لە مەڵبەندی موکریان

**شەغرە:** ئەو بارستا گیا یا وێنجە یا هەر شتێکی دروێنە کراو کە چەند باقەیەك دەبێ بەلام نەبەستراوە و خراوەتە سەر یەك

**شەغرە پێوەدان :** کێشانی شەغرە بە بارو پشتی چارەوا لە مەزراوە بۆ ماڵ، دابەستنی شەغرە لە سەر پشتی گوێدرێژیا هەر بارە بەرێکی دیکە

**فرێت:** پێ ،پێوەر ،بەو فرێتە ،بە و پێوەرە،بەوپێیە ،(دە تەون کردندا ) پۆ ، تێوەدان

**قابغ:** قاوغ ، قالب

**قاوە توون :** قاوەڵتوون : نانی بەیانی ،خواردنی پێش نەهار

**کاریگەر :** (موثر )،کورچۆبڕ،کارامە ،بەزەبر

**کلۆم :** جفت وبەستی درگا ،گۆڵە و کلیلە

**کۆللارە:** مەلێکی لاشەخۆرە وەك سیارکە کەچەڵە و داڵ

**کۆپان :** کورتان ،جل و بەرگی‌گوێدرێژ

**گەرناس :** سیاسەت زان ،ئاگادار ،هەڵکەوتوو ،زانا

**لەبنەوە بڕ :** فێڵباز ،ئاوری بن کا ، دەغەڵ ،غەیان ،کەسێك کە لە بنەوە زەربی خۆی دەوەشێنێ و ئاشکرای ناکا ،سیخور

**لرفاندن :** دەنگی بۆڵە بۆڵی وشتر لە کاتی توورەیی دا · هەر دەنگێك لەم چەشتە ،(لرفە لرفە)

**لێگەڕ :** گەریدە ،دنیاگەڕ ، جیهانگەڕ ، سەیاح

**میری :** دەسەلاتداری ، حکوومەت ، رژیم ، دەوڵەت

**مەرەد:** دەرد ، مەرەز(مرض) ، هۆ

**مەیل نان:** لە بیر کردن ، فەراموش کردن

**هەر دەگێل :** چۆلگەڕ ، چۆلگەرد ، ئاوارەی شاخ و کێوان

**هیما :** (اشارە ) ،ئیما ،دەست نیشانکردن

**هەوا :** تەرانە ،گۆرانی ،ستران ، ئاهەنگ

**هەتەر :** بڕینی مەودای دووربەچاو ، ئەو بارستایەی کە چاو دەتوانێ ببینێ

**هەڵداشتن :** توور دان ،دوور خستنەوە، فرێ دان

**هەسێل :** ئەستێر ،گۆل،گۆلاو،حەوز

